

# مێژووی زانستی نەخۆشییەکانی دڵ

د. شوان عوسمان ئەمین
پسپۆڕی نەخۆشییەکانی دڵ

دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

دەزگای فام بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دامەزراوەیەکە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب، لە 21/8/2019 دامەزراوە، هەوڵ دەدات بە شێوەیەک کتێب چاپ بکات، کە هەم لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، هەم لە ڕووی هونەری و تەکنیکییەوە لە ئاستێکی بەرزدا بێت، هەروەها لە ڕووی نرخەوە، دۆخی خوێنەران لەبەرچاو دەگرێ و هەوڵ دەدات کتێب لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ئەدەبی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و منداڵان و.... چاپ و بڵاو بکاتەوە..

فام: ئاوەز، تێگەیشتن [هەنبانە بۆرینە، هەژار: ل516]، [فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی: ل 664]. [فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەمەدی خاڵ: ل313]

FAMpublication

ڕۆحی پاکی باوکی خوالێخۆشبووم، پڕۆفیسۆر دکتۆر عوسمان ئەمین صالح، ئەو ڕۆحەی کە نموونەیەک بوو لە تابلۆی خاکیبوون و باوکێک بە چەشنی هاوڕێ و پەروەرشیارێکی ناوازە.

ئەو، فێری کردم کە کتێب و خوێندنەوە، بەشێکی سەرەکین بۆ بەرەوپێشچوونی هەر تاکێکی کۆمەڵگا لە هەر پیشەیەکدا.

ئومێد دەکەم ئەم بەرهەمە، سوپاسێکی بچووک بێت بۆ ڕۆحی پاکی، لەپای هەموو ئەو شتانەی فێری کردم.

# پێشەکی

یەکێ لە وتە زۆر گرنگ و ناسراوەکانی بیرمەندی گەورە «پلاتوو «ئەوەیە کە دەڵێ (پێویستی، دایکی داهێنانە)

لە زانستی پزیشکیدا هەمیشە هەوڵ و تاقیکردنەوە و نوێگەری، زیندوویەتی بەشەکەی ڕاگرتووە و بەردەوامی بەخشیوەتە کرۆکی بابەتەکە. ئەمە وای کردبوو کە پزیشکان هەمیشە بیردۆز و تاقیکردنەوە تەواونەکراوەکانی هاوەڵانی پێش خۆیان، پەرە پێ بدەن و بۆ باشترکردنیان لە هەوڵدا بن.

ئاشکرایە کە زانستی نەخۆشییەکانی دڵیش - کاردیۆلۆجی -لەم هەوڵە بێ بەش نەبووە، هەستیاری و گرنگی بەشەکە وای کردووە کە پزیشکان لە مەودایەکی کەم هەوڵ و نوێگەری زۆر بێننە نێو دونیای کاردیۆلۆجی.

هەماهەنگی لە نەتەوە جیاکان هەبووە و هەر لە وڵاتانی ئەورووپا و کیشوەری ئەمریکاوە، تا دەگاتە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، هەموو تەواوکەر و پێشەنگ و ڕێنیشاندەری یەک بوون لە هەر هەوڵێکدا.

ئەمەش وای کردبوو کە هەر داهێنانێک لە بوارێکدا ببێتە هەنگاوێک بۆ داهێنانێکی تر.

پزیشکان هەمیشە لە ڕێگای کۆنگرێس و کۆمەڵە پزیشکییەکانی

تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ، ئاڵوگۆڕی بابەتە نوێیەکانیان کردووە و لە دوایین بەرەوپێشچوونەکان یەکیان ئاگادار کردۆتەوە.

تاکە ئامانجیشیان لەم هەوڵە بەردەوامانە، سوودگەیاندن بووە بە دونیای چارەسەری پزیشکی بۆ نەخۆش و ئاسانکردنی کارە پزیشکییەکان بۆ ئەوەی تووشی کەمترین جێکەوتەی خراپ بن.

لە بەشێکی تری ئەم کتێبەی بەردەستتان هەوڵمان داوە تیشک بخەینە سەر دوایین هەوڵە نوێیەکان لە ڕێگاکانی چارەسەری کۆمەڵێک نەخۆشی، لە ڕێگای بەکارهێنانی نوێترین تەکنیک لەسەر ئاستی هەموو جیهان و دونیای کاردیۆلۆجی(نەخۆشییەکانی دڵ) بە تایبەتی.

لە سۆنگەی بەرپرسیاریەتیمانەوە بەباشمان زانی پەرتووکخانەی کوردی دەوڵەمەند بکەین بەم کتێبەی بەردەستتان و خوێنەران و فێرخوازانی کورد ئاشنا بکەین بەم بەرەوپێشچوونانەی هەنگاو بە هەنگاوی کاردیۆلۆجی(نەخۆشییەکانی دڵ)، تیشک بخەینە سەر ڕۆڵی وڵاتانی جیهان.

براتان

د. شوان عوسمان ئەمین

پسپۆڕی نەخۆشییەکانی دڵ

له سەرەتاکانی سـەدەی بیستەمەوە، شێوازی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکانی دڵ و موولولەکانی خوێن، بەرەوپێشچوونە فیسیۆلۆجیەکان، پێشبینیکردنی نەخۆشییەکان و گەڕان بەدوای فاکتەرە مەترسیدارەکان دەستیان پێ کرد.

هاوکات لەگەڵ ئەمانەشدا گەڕان بە دوای ڕێگاکان و تەکنیکی نەشتەرگەری و دۆزینەوەی چارەسەری پێویست له بەردەوام بووندا بوو، بۆ زیاتر بەرەوپێشچوون لە توێژینەوە زانستییە تاقیگەییەکان بۆ دۆزینەوەی دەرمانی پێویست و پێشکەوتنی زیاتر لە پیشەسازی دەرمان.

پسپۆری نەخۆشییەکانی دڵ (کاردیۆلۆجی)، پسپۆرییەکی نوێ بۆ زانستی پزیشکی، لەسەرەتاکانی ساڵی 1920 ەوە سەری هەڵداوە.

زانستە سەرەتاییەکانی وەک؛ کیمیا، فیزیا، زیندەزانی، کیمیای ژیانی، فیسیۆلۆجی و فیزیای ژیانی لێک دەدات و تێکهەڵکێش لەگەڵ ئەم زانستانە، نوێگەریەکی زۆر لە دونیای پزیشکی دروست دەکات.

لە نێو هەموو چەرمەسەری و کێشەکانی دونیای پزیشکیدا، ئەم پسپۆرییە نوێیە لە سەرکەوتن و بەرەوپێشچوون نەکەوتووە و هەمیشە بە دوای زۆرترین ئاسانکاری بۆ تەندروستی دڵی نەخۆشەکان هەوڵی داوە بۆ ماوەی سەدەیەکە.

# ڕێگایەکی درێژ: بۆ ماوەی بیست سەدە...

ئەم ئەندامە ناوازەی کە چالاکییەکەیمان گوێ لێ دەبێت و بە دەستیش هەستی پێ دەکەین، زانستەکەی بۆ ماوەی چەندین سەدە لە قاڵبی خەملاندن و فەلسەفەدا بە نەزانراوەیی مایەوە.

بۆ ماوەیەکی زۆر، پزیشکانیش هاوڕا بوون لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەی Aristotle بۆ بەراوردکردنی پێکهاتەیی دڵ لەگەڵ بیردۆزە فەلسەفییەکان لەسەر هەمان بابەت.

لە کاتێکدا کە باوکی زانستی پزیشکی Hippocrates -5th Century BC، دڵی وەک ئەندامێکی کۆئەندامی هەناسەدان هەژمارکردبوو، Aristotle هات و بە بیردۆزە نوێکانیەوە دڵی بە ئەندامێکی سەرەکی و دیاری کۆئەندامی سووڕی خوێن دانا، ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە هەموو مولولەکانی لە دڵەوە سەرچاوە دەگرن و دەگەڕێنەوە دڵیش.

ئەمەش ناونرا بیردۆزی دڵ-سەنتەریزم.



زانیاری توێکاری دەربارەی شێوە وپێکهاتەی دڵ بە نەزانراوی مایەوە تا ئەوکاتەی کە زانای توێکار Eustachio - Bartolomeo و Cesare Aranzio باسی پێکهاتە و چۆنیەتی دروستبوونی خانەکان و دەماوانەکان و پێکهاتە سەرەکییەکانی دڵیان کرد.



EUSTACHIO BARTOLOMEO

## مێژووی زانستی نەخۆشییەکانی دڵ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات

وەک هەر زانستێکی تر، کاردیۆلۆجیش بەرەوپێشچوون و پێشکەوتنەکانی هەر لە زووەوە گەیشتۆتە وڵاتانی ڕۆژهەڵات و تەنها لە ناو وڵاتانی ئەوروپی نەماوەتەوە.
لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش، زانا و پزیشکی ناوازە هەڵکەوتوون کە داهێنانەکانیان وەک ستاندەری جیهانی پشتی پێ بەستراوە.

## ئیبن سینا (Avicenna / 980 - 1037)

ئیبن سینا زانای بەناوبانگ لە زانستی پزیشکی و فرە شارەزا لە زۆر بواری تری وەک فیزیا، کیمیا، دەروونی، جیۆلۆجی و فەلەکناسی.
هەروەها شاعیرێک و ئایبناس و کەسێکی دیاری ناو ڕۆژهەڵاتی ناوەراست بووە.
لە بوخارا- ئۆزبەکستانی ئێستا لە نێوان ساڵانی 980-1037 لە دایک بووە.
ئیبن سینا لە تەمەنێکی زووەوە پێشکەوتنی بەرچاوی هەبووە لە زۆر

زانست، بە تایبەتی لە زانستی پزیشکیدا. لە تەمەنی 18 ساڵی وەک پزیشکێکی باوەرپێکراو هەژمارکراوە هەر لەو کاتەدا توانی چارەسەری نەخۆشییەکی زۆر دەگمەنی پێشەوای سەمانیدەکان بکات، کە بەشێکی زۆر لە پزیشکانی ئەوکات لە) چارەسەرکردنی دەستەوسان بوون. NUH II)

یەکێ لە شاکارەکانی لە زانستی پزیشکیدا داهێنان و نووسینی کتێبی (القانون فی الطب) بوو.

کتێبێکی ورد و فراوان و پڕ لە کە زانیاری لە توێی 5 بەشدا نوسراوە. تیایدا زانست و زانیاریی پزیشکی بە وردی، باس کراوە.

(هەم ئەوانەی کە لە سوردەمانی پێشووتر، هەم ئەوانەش کە لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی مومارەسە کرابوون)

کتێبی (القانون فی الطب) دواتر وەرگێڕدرا بۆ زمانی لاتینی و بوو بە یەکێک لە کتێبە باوەرپێکراوەکانی زانستی پزیشکی و لە هەموو زانکۆکانی ئەوروپا وەک ستاندەر لە سکولە پزیشکییەکان دەخوێندرا لە سەدەی 17.

لە توێژینەوەیەکی زانستیدا ئەو ڕاستییە دەرخـراوە کە لە نێوان سەدەکانی 11-17 کتێبەکەی زانا و پزیشکی دیار -ئیبن سینا- وەک سەرچاوەیەکی باوەرپێکراو لە سکول و زانکۆ پزیشکیەکان بووەتە پەیرەوی خوێندن و لەسەری خوێندراوە.

بەشێکی تایبەت لە کتێبی (القانون فی الطب) دا بەشێکی تایبەت تەرخان کراوە بە زانستی نەخۆشییەکانی دڵ-کاردیۆلۆجی -

وە ئیبن سینا بە داهێنەر و نوێگەر و پێشەنگ دەژمێردرێ لە بواری تاوتووێکردنی جۆرەکان و شێوازی لێدانەکانی دڵ (Pulsology)

هەروەها هەر ئەم خۆی جۆرە شێوازێکی تایبەتی دانا بۆ پشکنین و هەستکردن بە لێدانی دڵ، کە لە ڕێی پەنجەدانان لەسەر شوێنێکی دیاری مەچەکەوە بوو (ئەو شوێنەی کە خوێنبەرەکەی لێیە) و بەم جۆرە هەست بە لێدانەکانی دڵی مرۆڤ دەکرێ.

تا ئەمرۆش ئەم شێوازە بەکاردێ بۆ هەڵسانگاندنی لێدانی دڵ.

ئیبن سینا بە شێوەیەکی فـراوان باسی لە کاریگەرییەکان و هۆکارەکانی دڵەکوتە کردووە و ئەوەشی سەلماند کە چۆن گۆرانکارییە فیزیۆلۆجیەکان و دەروونییەکان کار دەکەنە سەر لێدانەکانی دڵ.

چیرۆکێکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێ تەنها بە هۆی گۆڕانکارییەکانی لێدانەکانی دڵی پیاوێکەوە ماڵی ئەو کچەی دۆزیەوە کە پیاوەکە خۆشی دەویست. (بە هۆی زیادبوونی لێدانەکانی دڵی تا دەهات و لە ماڵەکە نزیکتر دەبوویەوە)

(كتاب الادويات القلبية) ئەمەش یەکێکی ترە لەو کتێبانەی ئیبن سینا کە دواتر وەرگێڕانی بۆ کرا بۆ زمانی لاتینی و لە سەدەی 14 وەک سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو کاری لەسەر دەکرا.




## ئیبن ئەلنەفیس (1213 - 1288)

پزیشکێکی بە ڕەچەڵەک (خەڵکی وڵاتی سووریا) کە دەستێکی دیاری هەبوو لە تەواوکردن و پەرەسەندنی بابەتێکی گرنگ کە پزیشکانی پێش سەردەمی خۆی (کەمێک لە هاوسەردەمانیشی) خەریکی بوون و نەگەیشتبوونە ئەنجامێکی تەواو.

ئیبن نەفیس یەکێ لەو پزیشکانە بوو کا شارەزایی هەبوو لە بواری توێکاریدا، پێی وابوو سووڕی خوێن فراوانترە لەوەی تەنها لە ڕێگای

خوێنبەر و خوێنهێنەر بێت.

ئەو جەختی لەسەر ئەمە کـردەوە کە پردی نێوان خوێنهێنەر و خوێنبەرەکان، بریتیبن لە موولولەکانی خوێن - المنافیض، Capillaries - وە کەداری ئاڵوگۆڕی ئۆکسجین و ماددەکانی تر لەوێوە ڕوودەدات. ئەوەشی خستە ڕوو کە لە نێوان دڵ و سییەکاندا سووڕێکی تایبەتی خوێن هەیە (Pulmonary Circulation).

لە پێش ئەمیشدا پزیشکێکی تر بە ناوی Galen چەند زانیارییەکی هاوشێوەی خستبووە ڕوو، بەڵام زۆرینەی سەرچاوەکان ئیبن نەفیس بە کەسی یەکەم دەژمێرن بۆ تاوتوێکردن و زیاتر شیکردنەوەی بابەتی سووڕی خوێنی سییەکان.

هەروەها چەند زانیارییەکی توێکاری گرنگی خستە ڕوو دەربارەی خوێنبەرەکانی کۆڕۆنەری کە ڕاستەوخۆ خوێن بە ماسولکەکانی دڵ دەبەخشن.

ئیبن نەفیس جگە لەمانە خاوەنی دوو کتێبی پزیشکییە، ئەمانیش بریتین لە:-

- The commentary on Anatomy in Avcenna's Canon
- The comprehensive Book of Medicine



له ساڵی 1628 زانایەک بە ناوی William Harvey، بــەدوای ڕێسا سەرەتاییەکانی سووڕی خوێن گەڕا (Cardiovascular Haemodynamics)

لە دوای ئەویشەوە چەندین لێکۆڵینەوە ئەنجام درا سەبارەت بە بەیەکگەیشتنی نێوان خوێنبەر و خوێنهێنەر، کە پێی دەوترێ مولولە بچکۆڵەکانی دڵ و دەربارەی گۆڕانکاری هەوا، لە کیسە بچکۆڵەکانی ناو سییەکان کە پێی دەوترێ: Alveolar Sacs



- له سەدەی 18 له لایەن زانایانی فەرەنسا، ئیتاڵیا، بەریتانیا دەستکرا بە دەستنیشانکردنی چەند نەخۆشییەکی دڵ و دۆزینەوەی چارەسەرەکانیان بۆ یەکەم جار بە سەرکەوتوویی.

- له ساڵی 1715 Raymond Vieussens بۆ یەکەمجار نەخۆشی فراوانبوون و ناتەواوی له دەمەوانەکاندا دەستنیشان کرد

- له ساڵی 1768 Nicolas Rougnon و William Heberden بە تـەواوی باسی بابەتی ژانی سینگی تایبەت بە نۆبەی دڵیان کرد.





# مێژووی داهێنانکاری لە پشکنینی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ

- له ساڵی 1806 Jean-Nicolas Corvisart ڕێگایەکی تایبەتی پشکنینی دۆزییەوە (Percussion)
- له ساڵی 1819 Renè Th. Laennec ڕێگای پشکنینی دڵی داهێنا به گوێکرتن لێی، به هۆی ئامێری Stethoscope.
- له ساڵی 1827 Richard Bright پەیوەندی نێوان دڵ و نەخۆشیی گورچیلەکانی باس کرد.

- له ساڵی 1861 Auguste Chauveau و Etienne-Jules Mary توانیان بۆ یەکەم جار پێوانەی پەستانی خوێن بکەن له ناو دڵدا.

- له نێوان ساڵانی 1881-1896 Victor Basch و Rocci-Scipione Riva هەڵسان به پێوانەکردنی پاڵەپەستۆی خوێن له نێو خوێنبەرەکانی دڵدا (Arterial Blood Pressure)

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، کاردیۆلۆجی هێشتا وەک پسپۆرییەکی وردی سەربەخۆ دانەنرابوو، تا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم.

# مێژووی سەرهەڵدانی پسپۆرییەکە

زۆر بە وردی نازاندرێ کە کەی کاتی ناساندنی کاردیۆلۆجی بووە وەک پسپۆرییەکی سەربەخۆ لە لایەن کۆمەڵانی پزیشکی.

ئامار و ئاماژەی هەر وڵاتێک سەربەخۆیە و دەگەڕێتەوە سەر ئاستی پێشکەوتنی هەر یەک لە وڵاتەکان.

کاتی سەرهەڵدانی ئەم زانستە نوێیە دەکرێ لە ڕێگای چەند خاڵێک لێکبدرێتەوە کە ئاماژەیان پێ دەکەین:-

١/ کاتی بڵاوکردنەوەی ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی کە تایبەتن بە نەخۆشییەکانی دڵ و خوێنبەرەکانی دڵ.

٢/ کاتی دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوەیی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ و ئەنجامدانی یەکەم کۆنگرێسی خۆیان.

٣/ کاتی دامەزراندنی یەکەمین نەخۆشخانە و یەکەی نەشتەرگەری تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ.

٤/کاتی دامەزراندنی ڕاهێنراوانی پسپۆریی ورد لە بواری نەخۆشییەکانی دڵ لە زانکۆ و سکوڵە پزیشکییەکان.

لێکۆڵەری مێژوویی لە بواری کاردیۆلۆجی Bruce Fye دەستپێکی ئەم پسپۆرییە بەو کاتە دادەنێت کە پزیشکان توانیان لێکدانەوە و خوێندنەوە بکەن بۆ هێڵکاری دڵ، کە ئەمە لە ساڵی 1920 دا بوو.

## دەکرێ قۆناغەکانی سەرهەڵدانی کاردیۆلۆجی بکەینە پێنج قۆناغ، بەم شێوەیەی خوارەوە:-

قۆناغی یەکەم / 1910-1890

قۆناغی پێشڕەوی نووسین و بەدواداچوون و فێرکاری و لێکۆڵینەوەی زۆری لەخۆ گرت، ئەم قۆناغە لەسەر دەستی کۆمەڵێک لە زانا و پزیشکی دیار لە وڵاتانی جیا جیا بەڕێوە چوو.

کارەکانیان دەرگای بە ڕووی بەرەوپێشچوونی زیاتر کردەوە.

ئەمانە ناوی کۆمەڵێک لە پێشڕەوانن لە وڵاتانی جیا جیا:-

Charles Laubry , LouisGallavardin Henri Huchard, karel Wenckebach, James Mackenzie , Thomas Lewis, John Parkinson , Arthur Weber, Bruno Kisch, Franz Groedel, Paul D. White , Alfred Cohn , Filiberto Mariano , Cesare Pezzi , Luige Condrelli, Luis Calandre , Domingo Duran Arrom.

### قۆناغی دووەم / 1938-1908

پێشڕەوان و قوتابیەکانیان هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی یەکەم بڵاوکراوەی زانستیی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ و مولولەکانی خوێن.هەرچەندە لەم قۆناغەدا کۆمەڵەی پرۆفیسۆرانی ئەم بوارە دانەمەزرابوون و پاڵپشتی نەکرابوون و یەکەی تایبەت لە نەخۆشخانەکان نەبوون بۆ ئەم پسپۆرییە نوێیە.

یەکەمین بڵاوکراوەکان لەم وڵاتانەوە سەریان هەڵدا:-

بەریتانیا، ئەڵمانیا، ئیسپانیا، نەمسا، فەرەنسا و ئیتاڵیا.

### قۆناغی سێیەم / 1937-1915

لەم قۆناغەدا، پزیشکانی پسپۆری نەخۆشییەکانی دڵ سەریانهەڵدا و ژمارەیان لە زیادبووندا بوو، بەمەش کۆمەڵەی تایبەت بە خۆیانیان دامەزراند لە هەر یەک لە وڵاتەکان.

کۆی ٣١ کۆمەڵە لە ١١ وڵاتی جیا دامەزرێندرا.

### قۆناغی چوارەم / 1930-1919

کردنەوەی یەکەم یەکەی تایبەت بەم بەشە نوێیە لە نەخۆشخانەکان و سکوڵە پزیشکییەکان بۆ مەبەستی ئەکادیمی و لایەنی فێرکاریی زیاتر.

### قۆناغی پێنجەم / 1950-1944

لە کۆمەڵە نێودەوڵەتییەکانەوە  بۆ یەکەمین کۆنگرێسی جیهانی تایبەت

به نەخۆشییەکانی دڵ.

یەکەمین کۆمەڵەی نێودەوڵەتی لە ئەوڕوپا لە ساڵی 1946 و لە باکور و باشووری ئەمریکا لە ساڵی 1943 دامەزرێندرا.

لە ساڵی 1950 یەکەمین کۆنگرێسی جیهانی بەڕێوەچوو کە لەلایەن ئەمریکاوە ڕێکخرابوو و سەرپەرشتی کرا.

بڵاوکراوە و گۆڤاری تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ دامـەزران، پێشووتریش هەر هەبوون بەڵام بابەتی زانستی و پزیشکی تریشیان لە خۆ گرتبوو.

لێرەدا ئاماژە بە بەشێک لەو بڵاوکراوانە دەکەین:-

1908/ لە فەرەنسا یەکەم بڵاوکراوەی پزیشکی دەرچوو، سەبارەت بە پەیوەندی نێوان جۆرێکی کەمخوێنی لەگەڵ فشاری خوێن. لە لە لایەن Henri Vaguez ەوە کە بە یەکێ لە پێشرەوانی زانستی نەخۆشییەکانی دڵ دەژمێردرێ، بڵاوکرایەوە. ئەم گۆڤارە ئێستاش بەردەوامە.

1909 / لـە ئینگلتەرا ڕۆژنـامـەیـەکـی تـایـبـەت بـە زانستی نەخۆشییەکانی دڵ دەرچوو، دوای سی ساڵ، ناوەکەی گۆڕدرا بۆ The British Heart Journal ی ئێستا.

J. Mackenzie و T. Lewis کاریان لەسەر ئەم گۆڤارە پزیشکییە دەکرد بە بڵاوکردنەوەی بابەتە فیسیۆلۆجیەکان لەسەر سووڕی خوێن و دڵ. لە هەمان ساڵ لە نەمسا گۆڤارێک دەرچوو، وە تا ساڵی 1911 بەردەوام بوو.

1911 / له ئه‌ڵمانیا گۆڤاری پزیشکی تایبه‌ت به‌ نه‌خۆشییه‌کانی دڵ ده‌رچوو که‌ دامه‌زرێنه‌ره‌که‌ی B. Kisch و A. Weber بوون. و دوای ساڵی 1926 ناوه‌که‌ی گۆڕدرا بۆ Zeitschrift .fürukreislaufforschung

/ له‌ ئیتاڵیا F.Mariano و C.Pezzi گۆڤارێکیان ده‌رچوواند.1916

1920 / له‌ ئیسپانیا گۆڤارێکی پزیشکی ده‌رچوو له‌لایه‌ن پزیشکێکی گه‌نجی نه‌خۆشییه‌کانی دڵ، که‌ تا ساڵی 1936 به‌رده‌وام بوو.

1925 / له‌ ولایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا، American Heart Journal، که‌ به‌ گۆڤاری فه‌رمی کۆمه‌ڵه‌ی دڵی ئه‌مریکی داده‌نرێت، له‌ لایه‌ن Lewis A. Conner له‌ زانکۆی کۆڕناڵ ده‌رچوو.

له‌ ساڵی 1930 له‌ مه‌کسیک، له‌ ساڵی 1934 له‌ ئه‌رژه‌نتین، له‌ ساڵی 1935 له‌ ژاپۆن، له‌ ساڵی 1937 له‌ سویسرا و له‌ ساڵی 1938 له‌ کوبا گۆڤاره‌ تایبه‌ته‌کان ده‌رچـوون له‌ لایه‌ن پزیشکانی پسپۆری نه‌خۆشییه‌کانی دڵ.

ئه‌م کۆمه‌ڵانه‌ی که‌ تا ئێستا دروست کرابوون بۆ زانستی نه‌خۆشییه‌کانی دڵ، به‌شێکی زۆریـان له‌ لایـه‌ن زانایانی فیسیۆلۆجی و بواری توێژینه‌وه‌ی زانستی به‌ڕێوه‌ ده‌بردران، هه‌م له‌ وڵاتانی ئه‌وروپا، هه‌م له‌ ولایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا.

تا ساڵی 1933 که‌ له‌ چیکۆسلۆڤاکیا یه‌که‌مین کۆنگرێسی نێوده‌وڵه‌تی له‌ بواری زانستی نه‌خۆشییه‌کانی دڵ له‌ لایان پزیشکانی پسپۆره‌وه‌ به‌ڕێوه‌بردرا که‌ تیایدا 200 پزیشک له‌ 50 وڵاتی جیاوه‌ به‌شداربوون.

دواتر لە وڵاتانی ئەوروپا چەندین کۆمەڵە و کۆنگرێسی تایبەت بە کاردیۆلۆجی بەستران لەوانە:-
لە ساڵی 1934 لە ئیتاڵیا و هۆڵەندا
1936 لە بەلگیوم
1937 لە فەرەنسا بەڕێوەچوون.



له ساڵی 1936 پزیشکێکی پسپۆر له ژاپۆن که به یه‌کێ له پێشڕه‌وانی کاردیۆلۆجی داده‌نرا، له زانکۆی کیۆتۆ، کۆمه‌ڵه‌یه‌کی دامه‌زراند و یه‌که‌م کۆبوونه‌وه‌یان به به‌شداری 300 پزیشک ئه‌نجامدا.

له ساڵی 1946 له مه‌کسیک کۆمه‌ڵه‌ی کاردیۆلۆجی یان دامه‌زراند و یه‌که‌م چالاکیی خۆیان ئه‌نجام دا به نوێنه‌رایه‌تی 19 پزیشک له وڵاتی جیا جیا.

چوار پزیشکی گه‌نج له پشتی ئه‌م ئه‌رکه قورسه بوون و به‌ڕێوه‌یان ده‌برد.

له ساڵی 1960 The International Society of Federation of Cardiology دامه‌زرێندرا و دواتر له ساڵی 1995 ناوه‌که‌ی گۆردرا بۆ، World Heart Federation

له ساڵی 1949 له برۆکسل 14 کۆمه‌ڵه‌ی کاردیۆلۆجی کۆبوونه‌وه و به‌یه‌که‌وه کۆمه‌ڵه‌ی ئه‌وروپی کاردیۆلۆجییان دامه‌زراند که له لایه‌ن Charles Laubry , G. Nylin و John Parkinson ـه‌وه سه‌رپه‌رشتی ده‌کرا.

لـه دوای جه‌نگی جیهانی یـه‌کـه‌م، توێژینه‌وه‌ی زانستی و به‌ره‌وپێشچوونه‌کانی کاردیۆلۆجی، وه‌ک هه‌ر به‌شێکی تر به‌ره‌و ئه‌مریکای باکوور ڕۆیشت.

(که له سه‌ره‌تاکان دا زیاتر گۆڕانکارییه‌کان له ئه‌وروپا به‌دی ده‌کران)

یه‌کێ له به‌ره‌وپێشچوونه‌کانیش ئه‌وه بوو که هه‌ر دوو کۆمه‌ڵه‌ی AHA و کۆمه‌ڵه‌ی دڵی به‌ریتانیا و ئێرله‌ند، هه‌ڵسان به ناونانی هێله‌کانی

.ECG

(D1 , D2 , D3 , aVF , aVR , aVL)

که تا ئەم بەرواره ناولێنانەکە بە زمانی هۆڵەندی بوو.

لە ساڵی 1950 لە یەکەم کۆنگرێسی کاردیۆلۆجی لە پاریس پزیشکێکی ئەمریکی بە ناوی Paul D. While پەیامێکی گەیاندە هەموو پزیشکان و کۆمەڵە نوێیەکانی کاردیۆلۆجی، کە تیایدا گوتی :-

«ئێمە هاتووینە ئەم کۆنگرێسە لە وڵاتێکی نوێوە (نویٚ بۆ کاردیۆلۆجی- زانستی نەخۆشییەکانی دڵ) تاوەکو ستایشی پێشرەوانی دنیای کۆنی کاردیۆلۆجی بکەین و زانست و زانیارییەکانمان ئاڵوگۆڕ بکەین.

لە ماوەی 30 ساڵی ڕابــردوودا ئێمەی ئەمریکیەکان، توانیمان بەرەوپێشچوونی زۆر لە ڕووی توێژینەوە و پرۆفیشن و فێرکارییەوە بکەین بە توانایەکی زۆرەوە.

ئێمە لەم کۆنگرێسەدا هاتووین کارەکانی خۆمانتان پیشان بدەین بە بێفیزی و شانازییەوە بێ ئەوەی بمانەوەێ لە ئەرک و ماندووبوونی هیچ کایەنێک کەم بکەینەوە».

لە مەودای فێرکردنی فێرخوازاندا ئەمریکییەکان توانیان سوود لە توانای وڵاتانی ئەوروپا ببینن، بە تایبەت ئەڵمانیا، کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە دابینکردنی یەکەی نەخۆشخانەکان تایبەت بە فێربوون و ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی و زانستە سەرەتاییەکان.

لە نێوان ساڵانی 1870-1914 زیاتر لە 15 هەزار ئەمریکی ڕوویان لە ئەڵمانیا کرد، بۆ تەواوکردن و پەرەپێدانی زانستی پزیشکییان.

ئەمریکییەکان نوێگەرییەکیان کرد بە دانانی سیستەمی Philanthropy Scientfiic، بیرۆکەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ Rockefeller Foundation کە لە ساڵی 1913 دامەزرابوو.

ئەم کۆمەڵەیە پێشنیاری ئەوەی دا پزیشکان کە دەتوانن پاڵپشتیی ماددی تەواوی ئەو پزیشکانە بکەن کە دەیانەوێ لە سەر توێژینەوی زانستیدا کار بکەن و بگەنە زانستی نوێ بە شێوازی فول تایم- لە نەخۆشخانەکان.

بەم شێوەیە پزیشکان تەواوی توانا و کاتی خۆیان تەرخان کرد بۆ توێژینەوە و پاڵپشتی ماددییان وەردەگرت بۆ ئەوەی کێشەی ماددییان نەبێت.

لە کۆتایی ساڵی 1920 ئەم کۆمەڵەیە ئەنجامی زۆری دەست کەوت لە ڕێگای ئەم توێژینەوانە کە سوودی زۆریان گەیاندە زانستی پزیشکی، بەتایبەت کاردیۆلۆجی.

یەکێکی دیکە لە کارە ناوازەکانی کۆمەڵەی Rockeffeller ئەوەبوو کە دەستەیەکی دامەزراند بە ناوی Medical Education Division کە بۆ زیاتر بەمۆدێرنکردنی پرۆسەی خوێندنی کاردیۆلۆجی بەتایبەتی و پزیشکی بە گشتی پەرەپێدانی لایەنی توێژینەوەی زانستی هەوڵی دەدا لە دەرەوەی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لقی ئەورووپی ئەم دەستەیە لە پاریس دامەزرێندرا، بۆ ئەوەی هاوکاری بگەیەنێتە 26 وڵات.

لەم ڕێگایەشەوە توێژەرەوانی ئەورووپی هەڵبژێردران بۆ خوێندن لە

ئەمریکا.

- لە ساڵی 1915 لە ولایەتی نیویۆرک، Lewis A. Conne لە زانکۆی کۆرنیل، یەکەیەکی تایبەتی لە شێوەی نۆرینگە دامەزراند بۆ چارەسەرکردن و دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکانی دڵ.

- پزیشکێک بە ناوی Paul D. White کە دامەزرێنەری American Heart Association ە هەوڵی دا لە بەریتانیا بمێنێتەوە و لەسەر دەستی T. Lewis ەوە فێری زانستە سەرەتاییەکانی کاردیۆلۆجی ببێت.
- مامۆستاکەی (T.Lewis) یەکێ بوو لەو پێشرەوانەی کە دواتر هێڵکاری دڵی بە شێوەیەکی ڕۆژانە بەکارهێنا بۆ دەستنیشانکردنی بەشێک لە نەخۆشییەکانی دڵ.

- دواتـر پـاول، پزیشکە گەنجەکە خۆی یەکەیەکی تایبەتی بە نەخۆشییەکانی دڵی لە نەخۆشخانەی گشتی Massachasetts لە ساڵی 1918 کردەوە.

- له ساڵی 1929 یەک لە گەورەترین نەخۆشخانەکان لە نیویۆرک دروست کرا.

- لە بەریتانیا پڕۆسەی فێربوون لەسەر دەستی T. Lewis. بەڕێوەچوو، بە هاوکاری لەگەڵ پزیشکێکی تر بە ناوی James Makenizie دواتر لویس دەستی کرد بە گوتنەوەی وانە لە نەخۆشخانەی گشتی سەر بە زانکۆی پزیشکیی لەندەن.

- لە پاریس لە ساڵی 1923 یەکەم یەکەی کاردیۆلۆجی دروست کرا لە لایەن Charles Laubry، کە لە وتارێکیدا دەربارەی ئەم یەکو نوێیە گوتی: «ئیدی ئێرە تەنها یەکەیەکی چارەسەرکردن نابێ، بەڵکو دەبێتە سەنتەری لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی بۆ هەموو ئەو لایەنە نەزانراوانەی لێمان ونن، بەرپرسیاریەتیمان زۆرتر و زیاترە هەوڵی خۆمان دەدەین بۆ زیاتر فراوانترکردنی ئاسۆی زانستەکە».

- لە ئیسپانیا پزیشکێک بە ناوی Luis Ibanez کە خۆی خوێندنی پزیشکی لە مەدرید تەواو کرد، پاشان بە مەبەستی خوێندنی پسپۆڕیی ورد لە کارەباییاتی دڵ لە ساڵی 1912 ڕۆشتە ئەڵمانیا.

دواتر کە گەڕایەوە ئیسپانیا، هێڵکاری دڵی بە دونیای ئەوێ ناساند، وانەی پزیشکی و کاردیۆلۆجی دەگوتەوە و بەشێکی باش لە زانستەکەی سوودمەند بوون. 7 کتێب و زیاتر لە 60 وتاری زانستی بڵاوکردەوە، کە زیاترینیان لەسەر جۆرەکانی نارێکی لێدانی دڵ بوون لە نێوان ساڵانی 1910-1937.

## لە ئەڵمانیا و ئەو وڵاتانەی کە زمانی ئەڵمانی زمانی سەرەکییان بوو، بەرەوپێشچوونی بەرچاو بەدی دەکرا، لەوانە:-

- لە ساڵی 1929 یانەیەکیان دامەزراند تایبەت بە نەخۆشیی خوێنبەرەکانی دڵ.
- لە ساڵی 1938 توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی ورد ئەنجام درا لەسەر جۆرەکان و شێوازی نارێکیی لێدانەکانی دڵ.
- لە ساڵی 1933 زیاتر پەرە بە تیشکی X درا، بۆ دەستنیشانکردنی بەشێک لە نەخۆشییەکانی دڵ.

دواتر پزیشکانی کۆمەڵەی ئەمریکی و ئەڵمانی بەیەکەوە بۆندی خێرا لە نێوانیان دروست بوو، پەیوەندییەکانیان زیاتر پەرەی پێ درا و نوێگەری و کار و چالاکی زیاتریان پێشکەش بە دونیای کاردیۆلۆجی- زانستی نەخۆشییەکانی دڵ - کرد.

بەرەوپێشچوونەکان لە ئیتاڵیا لەسەر دەستی پزیشکی ڕاهێنراو L. Condorelli بوو لە ڕۆما.

لە ساڵی 1922 ئەم پزیشکە بەشداری کردبوو لە چەند کلاسێکی کاردیۆلۆجی لە ڤیەننا دواتر گەڕایەوە ئیتالیا و یەکەی تایبەت بە کاردیۆلۆجی دانا و لە زانکۆکان و نەخۆشخانەکان بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی دڵ لە ڕۆما.

لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین (مەکسیک، کوبا و ئەرژەنتین) کاردیۆلۆجی لە ساڵی 1933 بەرەوپێشچوونی بەخۆیەوە بینی.

دواتر لە مەکسیک پەیمانگایەکی تایبەتی کاردیۆلۆجی دامەزرێنرا،کە بە شێوەیەکی بەرچاو زیاتر بە ڕووی پرۆسەی تاڵدانان و زانستی کارەباياتی دڵ و نارێکی لێدانەکانی دڵدا کرایەوە.

لە نێوان ساڵانی 1950 - 2006 کۆنگرێسی جیهانی کاردیۆلۆجی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ، هەموو چوار ساڵ جاریک ئەنجام دەدرا دواتر دوو ساڵ جارێک.

یەکەم کۆنگرەی ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی 1933 ئەنجام درا بەڵام دواتر لەبەر ڕوودانی جەنگی جیهانی دووەم هەموو کۆنگرێسەکان ڕاگیران.

لە 1946 لە مەکسیک، پزیشکێکی پسپۆری نەخۆشییەکانی دڵ دامەزرێنەری کۆمەڵەکە بوو بڕیاری دا یەکەم کۆنگرێس لە پاریس ڕێکبخات لە بەرواری 1950/9/3.

لەو کاتەوە 17 کۆنگرێس بەستراون:

6 لە ئەوروپا

6 له ئەمریکا

4 له ئاسیا

1 له ئوسترالیا

له ماوەی ئەو هەموو کۆنگرێسە، هیچ کام له کۆمەڵەکان نەیانتوانی باشتر بن له(AHA - ESC- ACC) له ڕووی کوالیتی پێشکەشکردنی توێژینەوەکان و چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کۆنگرێسەکان ئێستا European Society of Cardiology (ESC) به سەرکەوتووترین کۆمەڵەی کاردیۆلۆجی هەژمار دەکرێت له ڕووی کواڵیتی پێشکەشکردنی توێژینەوەی زانستی به فیدباکی بەشداربووان.

ESC یەکەم کۆنگرێسی خۆیان له لەندەن لەساڵی 1952 ئەنجام دا هەر چوار ساڵ جارێک دواتر له دوای ساڵی 1988 هەموو ساڵ جارێك.

له ساڵی 2011 له پاریس به بەشداربوونی 33000 بەشداربوو که تیایدا 27500 بەشداربوونی چالاك به زیاتر له 10000 توێژینەوەی زانستی بەشدار بوون.

AHA -American Heart Association له ساڵی 1924 له نیویۆرک دامەزرا زیاتر ئەو پزیشکانەی ڕاکێشا که پێگەیەکی زانستییان هەبوو له کاردیۆلۆجی.

هەوڵی دا زیاتر ئامانجی هۆشیاری و پارێزگاری له نەخۆشییەکانی دڵ بڵاوبکاتەوە.

American College of  Cardiology  (ACC) له ساڵی 1948 له ماری لاند دامەزێندرا که له پێشبرکێدایه لەگەڵ AHA بۆ سازدانی  کۆنگرێسی زیاتر له هەموو ولایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لە سەدەی 19 پزیشکان زیاتر بۆیان دەرکەوت کە زانیاری دەربارەی توێکاری و فەسلەجەی دڵ، وای کردووە زیاتر پێش بکەون، لە ڕووی چارەسەر و هەڵسەنگاندنی کاری دڵ و دۆزینەوەی کێشەکانی تایبەت بە دڵ.

بەم شێوەیە بەرەوپێشچوونە تەکنیکییەکان، کە بە هەماهەنگی زانایان و پزیشکانی پسپۆری دڵ، ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە کاردیۆلۆجی لە زانستێکی سەرەتاییەوە بووە بە پیشەیەکی کلینیکی ڕۆژانە.

لە ساڵی 1842 Carlo Matteuci باسی ئەو تەزوانەی کارەبای کرد کە لە دڵدا دەردەچن لە کاتی لێدانی دڵ، ساڵانی دواتر زانای ئەڵمانی E. Dubois-Reymond دەستی کرد بە لێکدانەوەی کرداری ئاڵوگۆری خوێیەکانی دڵ، لە کاتی گرژبوون/ خاوبوونەوەی دڵ. (Action Potential)

ئەم دۆزینەوە نوێیە دوای نیو سەدە کار و توێژینەوەی لەسەر کرا، بۆ زیاتر هەڵسەنگاندنی چالاکیی کارەبایی دڵ و دروستکردنی ئامێری گلڤانۆمیتر بۆ پیشاندانی هێڵکاریی دڵ.

لە ساڵی 1887 زانای فیسیۆلۆجی بەریتانی Augustus D. Wallet وتارێکی زانستی لە گۆڤاری Journal Of Physiology بڵاو کردەوە بە ناونیشانی (پیشاندانی گۆڕانکارییە کارەباییەکان لە دوای هەر ترپەیەکی دڵ)

ئەم وتارە ئاماژەی بە یەکەم گۆڕانکارییە تەزووییەکانی

دڵ دەکرد.

لە کۆنفرانسێکی زانستی لە ساڵی 1888 لە بارەی ئەم باسەوە گوتی:

"دەمەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە کە دەکرێ دڵی مرۆڤ وەک ئامێرێکی تەزووی کارەبایی سەیر بکرێ و زۆر شتی لەم بارەیەوە لێ بە دەست بهێنین و پێی بگەینە ئەنجامی نوێ بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکانی دڵ".

دوو ساڵ دواتر Waller دەستی کرد بە تاقیکردنەوەیەک لەسەر سەگەکەی خۆی کە تیایدا، دوو وایەری کارەبایی لە پێستی سەگەکەی بەست، بۆ پێوانەکردنی ئەو تەزووە کارەباییەی کە دڵی سەگەکەی دەری دەدات.

ئینجا گەیشتە ئەنجام.

دواتر توێژینەوەکان لە بەریتانیا زیاتر پەرەیان بەم بیردۆزە داهێنا و لە ساڵی 1891 ئەوەیان دەرخست کە سێ شەپۆلی کارەبایی هەیە لەگەڵ هەر لێدانێک، ئەوانیش (P-QRS -T)ن

پزیشکێک بە ناوی William Einthoven، زیاتر ورد بوویەوە لەو ئامێرەی کە دەیتوانی تەزووە کارەباییەکان بکاتە هێڵکاری دڵ، بۆی دەرکەوت کە پێویستیان بە گلڤانۆمیترێکی خێراترە بۆ ئەوەی بتوانی هەموو چالاکییەکان تۆمار بکات لە شێوەی هێڵ، بۆ ئەم مەبەستەش لە ساڵی 1901 وتارێکی زانستی بڵاوکردەوە و تێیدا ڕوونی کردەوە کە ئامێرێکی نوێ بەڕێوەیە بۆ بەهێڵکردنی چالاکییە کارەباییەکانی

دڵ.

هیوای خواست کە بە هۆی ئەم ئامێرەوە بتوانن کێشە کارەباییەکانی دڵ بدۆزنەوە و چارەسەری پێویستیان بۆ بکەن.

تەزووەکان لەسەر پەڕاوی تایبەت دەکێشران لە شێوەی هێڵ و بەرزی و نزمیی تایبەت (بەپێی چالاکیی کارەبایی دڵ) و توانای گرتنی 2mV هەیە.

کێشی سەرەتایی ئەم ئامێرە 300 کیلۆ بوو.

هەر لە ساڵی 1901 دەستکرا بە گرتنی هێڵکاریی دڵ.

نەخۆشەکە پێویست بوو دەستێک و قاچێکی لەناو ئاوێکی خوێاودا بووایە و تەلە کارەباییەکانیش لە ناو سەتڵی ئاوەکە دەبوون.

هەر هەمان پزیشک Einthoven ناوی هێڵکاریی دڵی بە EKG برد.

ساڵی 1906 پزیشکە هۆڵەندییەکان هەڵسان بە پۆلێنکردنی هێڵکاریی ئاسایی و نائاسایی و گۆڕانکارییە ماسولکەییەکان لە لە سکۆڵە LVH، لێدانە نارێکەکان (نبضات الهاجرة -PVCs) و دیاریکردنی هێڵکاریی برانی ڕێڕەوی تەزووی کارەبایی دڵ BBBs.

لە ساڵی 1924 ئەم پزیشک و داهێنەرە بووە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە پای ئەم

## بەرەوپێشچوونی زیاتر لە ئامێری هێڵکاریی دڵ

لە ساڵی 1908 هێڵکاری دڵ گەیشتە بەریتانیا و لە لایەن گەورە پزیشکی ئەوێ T.Lewis گرنگی زۆری پێ درا و بەکاریان دەهێنا لە کلینیکی ڕۆژانەیان بۆ نەخۆشەکانیان.

1912 هەمان پزیشک وتارێکی گرنگی بڵاو کردەوە دەربارەی ڕۆڵی هێڵکاریی دڵ لە دەستنیشانکردنی نەخۆشەکانی دڵ لە گۆڤاری BMJ

- لە ساڵی 1910 هێڵکاریی دڵ گەیشتە وڵاتانی ئەمریکا و بووە مایەی باسکردن لە زانکۆ و یەکەکانی فێرکردنەوە.
- دواتر لە ساڵی 1912 ناوەکەی کرا بە ECG.
- لە ساڵی 1917 بە شێوازی نوێ و قەبارەی بچووکەوە (25 کیلۆ) ئامێرەکە دروست کرا لە لایەن کۆمپانیای Frank Sanborn.
- لە ساڵی 1932 بەرەوپێشچوونی زیاتریان کرد ئەمریکیەکان و شەش لیدەکەی سنگیان داهێنا (V1-V6)
- دواتر لە ساڵی 1942 ژمارەی لیدەکانیان کردە 12 لید و لە 12 گۆشەوە چالاکییە کارەباییەکانی دڵ تۆمار دەکران.
- دوای نزیکەی دە ساڵ، ئامێرەکە بە شێوازی نوێتر

دروست کرا و کێشی ئامێرەکە 3 کیلۆ بوو.

- دواتر لە ساڵی 1980 بە دواوە چەندەها کۆمپانیا جۆر و شێوازی جیا جیایان دروست کرد.

## مێژووی داهێنانی ئامێری تریدمل -هێڵکاریی دڵ بە ڕاکردن -

پەیوەندی نێوان وەرزشکردن (ڕاکـردن و ماندووبوون) لەگەڵ خوێنبەرەکانی دڵ و نۆبەی دڵ و گۆڕانکارییە هێڵکارییەکان پزیشکانی هان دا کە بە دوای پشکنینێکی پێشبینیکردنی گیران/تەسکبوونەوەی خوێنبەرەکان بگەڕێن، کە پەیوەندی هەبێ بە ژانی سینگەوە (Angina) لە ساڵی 1919 یەکەم پشکنینی هێڵکاریی دڵ بە ڕاکردن (ETT) ئەنجام درا لە لایان پزیشکی فەرەنسی Camille Lian لە نەخۆشخانەی Tenon دواتر لە ساڵی 1929 لە ئەمریکا Sinai Hospital , پزیشکێک بە ناوی Arthor Master لەگەڵ یاریدەرەکەی هەڵسان بە ئامادەکردنی خشتەی هەڵسەنگاندنی نەخۆش بەپێی تەمەن، ڕەگـەز، جۆر و چەندیەتی گۆڕانکاریی هێڵکاریی دڵ، کێش... چەند پێوەرێکی تر بۆ ئەم پشکنینە نوێیە.

لە ساڵی 1960 ناویان نا پشکنینی تریدمیل، نەخۆشەکە لەسەر پایسکیلێک دەبوو و ڕای دەکرد و هێڵکاریی دڵی تۆمار دەکرا.

# مێژووی داهێنانی ئامێری هۆلتەر

لە ساڵی 1947 هۆڵتەر لە لایان زانای فیزیایی ئەمریکیNorman Holter داهێنرا ئەم ئامێرە لە توانای بوو هێڵکاریی دڵ تۆمار بکات و کێشەکەی ٨٣ کیلۆگرام بوو.

لە ساڵی 1961 بە دواوە وەک پشکنینێکی ڕۆژانە بەکاریان دەهێنا. سەرەتا توانای تۆمارکردنی 60 خولەکی هەبوو.

لە دوای ساڵی 1980 وە پێشکەوتنی زیاتر کرا بۆ ئامێرەکە و کرا بە ئامێرێکی زیرەکی بچووک، کە توانای تۆمارکردنی 24-48-72 کاتژمێری هەبوو.

له بەرواری Rontgen 1815/11/8 بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە کاتی کارکردنی لە تاقیگە، بۆی دەرکەوت کە دەکرێ بە هۆی هەندێ ماددەی کیمیاییەوە (وەک: باریۆم) لە ڕێگەی تیشکی X ـەوە بتوانن سەیری بەشێکی دیاری لەش بکرێ، ئەم بیرۆکەیە دەرگای گەورەی لە کاردیۆلۆجی کردەوە بە ڕووی پزیشکاندا.

بە شێوەیەکی فەرمی بیرۆکەکەی خۆی ئاشکرا نەکرد تا بەرواری 1896-1-23.

لە فەرەنسا هەمان هەوڵ دران لە لایان کۆمەڵە پزیشکێکەوە و دواتر یەکەم وێنەی تیشکی سینگی نەخۆشێکیان گرت بە هۆی ئەم ماددەیەوە و لەسەریان نووسی کە "فراوانبوونی شادەماری گەورە - دوای 40 خولەک بەرکەوتن بە تێشکی X"

نـاوی ئـەم پرۆسەیەشیان نا (Dioptro-Organoscopu by Photoelectrographic Procedures)

دکتۆر Antonine Beclem لە فەرەنسا لە ساڵی 1897 کۆبوونەوەیەکی ئەنجام دا و تیایدا بانگهێشتی هەموو پزیشکان و پسپۆرانی بواری تیشکی کرد و ئـەوەی خستە ڕوو کە دەکـرێ بەشێکی باش لە نەخۆشییەکان/ ناتەواوییەکانی دڵ بە تیشک دەستنیشان بکرێ وەک:- PE , Dilatation of Aorta, Aortic Aneurysms, Dilated Heart.

پزیشکانی نەخۆشخانەی بۆستن ئامێرێکیان دروست کرد کە شێوەکەی گونجاو بوو لەگەڵ سینگی نەخۆشەکە، بە مەبەستی پیشاندانی وێنەی تەواو و بێ کێشە.

لە ساڵی 1920 بەشێکی زۆر لە نەخۆشییەکانی دڵ دەکرا دەستنیشان بکرێن بە هۆی بەکارهێنانی تیشکەوە.

## مێژووی داهێنانی پرۆسەی تاڵدانان (قسطرە)

بیرۆکەی بەکارهێنانی تاڵ (قسطرة) بۆ ناو خوێنبەرەکانی دەست و قاچ، سەریهەڵدا لە لایەن E.J. Marvey و August Ch. کە زۆر تاقیکردنەوەیان لەسەر ئەسپ ئەنجام دا لە نێوان ساڵانی 1861-1864 لە سکوڵی پزیشکیی ئاژەڵان لە نزیک پاریس.

ئامانجەکە ئـەوە بوو کە زیاتر ئاشنا بن بە قۆناغەکانی گرژ بوونەوەی ماسولکەکانی دڵ (سکۆڵە و گوێچکەلە) بەم پرۆسەیە گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە لێدانەکانی دڵ بەهۆی گرژبوونەوەی ماسولکەکانی سکۆڵەوە ڕوو دەدەن (پێشتر وا باس کرابوو کە بە هۆی خاوبوونەوەیانەوە ڕوودەدات).

لە ساڵی 1923 پزیشکی ئەڵمانی Joseph Berberich و Samson Hirsch یەکەم پرۆسەی تاڵدانان Angiography یان ئەنجام دا لەسەر مرۆڤ بە بەکارهێنانی ماددەی Strontium Bromide.

لە ئەمریکا لە ساڵی 1924 هەمان پرۆسە ئەنجام درا بە بەکارهێنانی ماددەی Sodium Iodide.

## پرۆسەی تاڵدانانی فرۆسمان بۆخۆی!

لە بەرواری 5-11-1929 پزیشکێکی گەنجی تەمەن 25 ساڵان بە ناوی Th.O. Forrssmann تاڵێکی لە خوێنبەرێکی دەستی خۆی دانا و بردیە ناو دڵی خۆی، کەمێک هەستی بە دڵەکوتە کرد و دواتر بە هاوکاری پەرستارێکەوە ڕۆشتە بەشی تیشک و وێنەیەکی تیشکیی دەستی خۆی وەرگرت و بینی تاڵەکە لەناو دڵیەتی.

ئەم پزیشکە ویستی لەم ڕێگایەوە دەرمان بنێرێت بۆ دڵ و خێراتر دەرمانەکە کار بکات.

مامۆستاکەی Dr. Schneider ئەم هەنگاوەی قوتابییەکەی بەرز نرخاند و پێی باشبوو لە گۆڤارێکی زانستیدا بڵاوی بکاتەوە.

دوای بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە لە بەرواری 1-8-1930 Otta Klein یەکەم هەوڵی خۆی دا بە سەرکەوتوویی بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی تاڵدانان. کە لە نێوان 18 هەوڵدا، 11 دانەی بە سەرکەوتوویی ئەنجام دا.

لە نیویۆرک لە ساڵی 1940 هەوڵی تاڵدانان بۆ لای ڕاستی دڵ درا لە ساڵی 1950 کۆمەڵێک زانا سەرکەوتوو بوون لە دانانی تاڵ بۆ بەشی چەپی دڵ لە ڕێگای خوێنبەرەکانی دەستەوە.

دواتر لە ساڵی 1955 پزیشکی گەنج Forrssmann خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا.

## بەرزترین و گرنگترین هەنگاو پیشاندانی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری

لە ساڵی 1958 پزیشکێک لە کاتی کارکردنیدا کۆمەڵێک ماددەی ئایۆدینی لە دەست دەرچوو و ڕۆشتە ناو خوێنبەرەکانی کۆرۆنەرییەوە و بەمەش لە ژێر تیشک دا خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری زۆر بە جوانی دەرکەوتن، ئەمە بووە دەستپێکێک بۆ پرۆسەی پیشاندانی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری و پزیشکان دڵنیا بوونەوە لەوەی ئەم ماددەیە زەرەری نییە بۆ خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری.

دواتر لە شیکاگۆ داهێنان کرا و ئامێری CT Scan داهێنرا کە وێنەی ورد ورد و پارچە پارچە بەشێکی لەشی دەگرت لە ڕێگای تێشکەوە.




CT scan

بەکارهێنانی ئامێری سۆنەر بۆ پیشاندانی ڕێڕەو و جووڵەی خوێن لە خوێنبەرەکاندا.

ئەمە لە نێوان سالآنی 1953-2003 سەری هەڵدا و پەرەی سەند کە لە سوید لە زانکۆی لوند، لە بەرواری 1953/10/29 یەکەم وێنەی ناتەواوی دڵ وەرگیرا لە لایەن Inge Elder و Gustave Hertz کە براوەی خەلاتی نۆبڵ بوو.

لە کۆنگرێسی سێیەمی جیهانی دڵ دا لە ڕۆما لە ساڵی 1960 Elder. هەوڵی دا لە ڕێگەی کورتە فیلمێکەوە باس لە گرنگیی سۆنەر بکات بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشیی هەوکردنی پەردەی دەرەوەی دڵ Pericarditis و بەشێک لە نەخۆشیی دەمەوانەکان.

دواتر سۆنەر و دۆپلەر بوون بە دوو توڵی بەهێز و گرنگی کاردیۆلۆجی کە بۆ هەڵسەنگاندنی ئاراستەی جووڵە و ڕێڕەوی خوێن.

دۆپلەر لە ساڵی 1970 بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە لە زۆر وڵات بەرەوپێشچوو و بەکار هات بۆ هەڵسەنگاندنی ئاراستەی خوێن لە خوێنبەرەکانی مل و ئاراستەی دەمەوانەکان.

دواتر لە کۆتایی ساڵی 1999 ئامێری تیشکی موگناتیسی MRI داهێنرا بۆ بینینی دڵ و خوێنبەرەکانی بە هۆی بەکارهێنانی ماددەی .Gadolinium Chelate

بەرەوپێشچوون و نوێگەرییەکی زۆر لە زانستی پزیشکی ڕوویان دا لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لە ژێر ناونیشانی Non-Invasive procedures.

ئەم پرۆسە کردارییانە لەسەر بەشی پزیشکی نەخۆشییەکانی دڵ ئەنجام درا و ناسێنرا لە ساڵانی 1970 وەك پرۆسەی تاڵدانان (قسطرة) لەوکاتەوە تاڵدانان بۆتە کرۆکی کاردیۆلۆجی هەنگاوەکانی سەرەتا لە ساڵانی 1977 لەلایەن Andreas Gruentzing دەستی پێ کرد پەرەی پێ درا لە لایەن پێشڕەوان و گۆرانکاری گەورە و دیاری دروست کرد لە چارەسەرکردن و دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکانی دڵ و نەخۆشییەکانی دەمەوانەکان و نارێکی لێدانی دڵ و کێشەی خوێنبەرەکانی مل.

دەستپێشخەری ئەم بوارە لە کاردیۆلۆجی، Andreas R.Gruentzing و ئارەزووی، بۆ ئەم جۆرە کردارانەی کە لە ڕێگەی پێستەوە دەچێتە ناو دڵ بەهۆی تاڵ (وایەری تایبەت) هەر 1969 دەستیپێکرد کاتێ لە کلینیکی Max - Ratschow کاری دەکرد.

لە ساڵانی 1971-1972 چەند ڕاهێنانێکی ئەنجام دا لە بواری تیشك و ئەو پرۆسەی تاڵدانانە لە ڕێگەی پیستەوە بۆ چارەسەری خوێنبەرەکانی لەش بەتایبەتی (پەڵەکان- دەست و قاچ)

Andreas سەرەتا شێوازی Dotter ی بەکار دەهێنا بەڵام بە دوای تەکنیکێکی نوێتر دەگەڕا.

دواتــر ئاشنا بوو بە H.Hopff پزیشکێکی خانەنشین لە بواری جوانکاریی ورد لە زاکۆی Swiss-Technical of Zurich، کە پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد ماددەی PVC بەکار بێنێ بۆ ئەوەی بالۆنێکی قوچەکی پێ دروست بکات.

تاڵێکی دروست کرد و بەو ماددەیە- بەبالوونەوە- و بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر بەم شێوەیە لەسەر نەخۆشەکان کاری دەکرد.

لە 22/19/1973 یەکەم پرۆسەی فراوانکردنی خوینبەرەکانی دڵ لە ڕێگەی بالوونەوە ئەنجام درا.

ئەمە ئەنجام درا بۆ تەسکبوونەوەیەك کە لە ڕێگەی نەشتەرگەریەوە دروست بووبوو.

زانایانی ئەم سەردەمە زۆر داوایـان کرد کە ئەم تاقیکردنەوەیە ڕاگرن و چیتر ئەنجامی نەدەن بەڵام پزیشکەکان زیاتر هەوڵیان دەدا و دەگەڕان بەدوای باشترین هەڵبژاردە، دواتر تاڵێك دروست کرا کە دوو ڕێڕەوی هەبوو Double lumen Catheter لە لایەن کۆمپانیایSchneider med AG و لە چاوەڕوانی یەکەم بەکارهێنانیدا بوون.

لە 1977/5/9 پرۆسەی تاڵدانان و فراوان کردنی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری لە ڕێگەی بالۆنەوە بووە واقعێکی ئەو سەردەمە و بۆ زۆر نەخۆشی و لە زۆر حاڵەتدا بەکاردەهێنران.

نەخۆشێک کە بە هۆی ژانی سینگەوە ڕەوانی سەنتەری چارەسەری دڵ

کرابوو، پڕۆسەی تاڵدانانی بۆ ئەمجام درا و دەرکەوت تەسکبوونەوە و کەڵەکبوونی چەوری هەیە لە بەشی سەرەوەی خوێنبەری چەپی LAD، دوای چەند ماوەیەک ئەم نەخۆشە پڕۆسەی تاڵدانانی بۆ ئەنجام درا بە مەبەستی چاودێری باری تەندروستی و دەرکەوت کەڵەکەبوونەکە نەماوە و ئەنجامی باشی هەبوو، نەخۆشێکی دیکە کە تەسکبوونەوەی هەبوو لە دەماری سەرەکی چەپی LMS بەڵام ئەنجامەکەی وەك کەسی یەکەم نەبوو و بە کەمی بەرەوپێشچوونی هەبوو.

دواتـر لە گۆڤاری NEJM توێژینەوەیەک کرا دەربـارەی ئەو نەخۆشانەی ئـەم پڕۆسەیەیان بۆ ئەنجام درابــوو، لەنێوان ساڵانـی 1977-1981 ئەنجامەکان بـڵاوکـرانـەوە پـڕۆسـەی تاڵدانان و فراوانکردنی خوێنبەرەکان تەنها بۆ ئەم نەخۆشانە ئەنجام دەدرا:-

١- نیشانەی نەخۆشی هەبێ

٢- کارکردنی دڵی باش بێت

٣- بەرگەی نەشتەرگەری بگرێ لە ئەگەری ڕوودانی هەرکارێک.

Andreas خۆی لە کۆبوونەوەیەك دا ئـەوەی ڕاگەیاند کە ئەم پڕۆسەیە دەبێ بۆ گرووپێکی کەمی نەخۆش ئەنجام بدرێ، یەک لە هۆکارەکانیش شێوازی دیزاینی تاڵەکە بوو، کە بەکار دەهێنرا وایەرێکی

ڕێنیشاندەری زۆر بچووک و جێگیری هەبوو لە بەشی سەرەوەی باڵۆنەکە، بۆئەوەی ڕێگری بکاتە لە نوشتاندنەوەی لە کاتێک دەبردرێتە ناو خوێنبەری کۆڕۆنەری.

قەبارەی باڵۆنەکە (2-1.5 ملم) بووە وە ڕێگر بوو لەوەی بەناو تەسکبوونەوەی زۆردا بڕوا، لەبەر ئەمە بوو کە تەنها دەکرا بۆ ئەو نەخۆشانە بکرێ کە تەسکبوونەوەکانیان زۆرە یان تەواو بە تیرەی خوێنبەرەکە نییە و زیاتر لەو خوێنبەرانە بەکار دەهات کە پێچاوپێچیان کەمە وەك LAD و بەشی سەرەوەی RCA.

هەنگاوێکی گرنگ لە لایەن John B. Simpson نرا، کە داهێنانی وایەری ڕێنشاندەری جووڵاو بوو. Steerable guide-wire ئەمەش وای دەکرد بە ئاسانی لە ژێر کۆنترۆڵی خۆت بیجووڵێنی بەو شێوەی کە دەتەوێ بیخەیە ناو خوێنبەرەکان.

لە ناوەڕاستی ساڵی 1980 ئەم جۆرە تاڵانە Monorail پرۆسەی فراوانی خوێنبەری ئاسانتر و بێ کێشەتر کرد، ژمارەی ئەنجامدانی پرۆسەکە زۆر زیادی کرد و دواتر بینیان ٪30-٪40 لە نەخۆشەکان تووشی دووبارە گیرانەوە Restenosis دەبنەوە.

هەر چەندە کە ئەنجامدانی پرۆسەکە ئاسان بوو، بەڵام ئەم ڕێژە زۆرە وای لە پزیشکان و ئەندازیارانی تاکنیکی و زانایان کرد کە

چەندەها توێژینەوە ئەنجام بدەن لەسەر 50000 نەخۆش و بگەنە ئەنجامێکی نوێ بۆ دەستەبەرکردنی کەرستە و پێداوستی نوێ کە ڕێگری بکات لە دووبارە گیرانەوە نەك تەنها بە دەرمان بۆ نەهێشتنی (چەوری، ماددە، خوێنی مەییوو) ئەمەش بە دەستپێکی سەرهەڵدانی دروستکردنی ئامێرێکی نوێ دانرا.

Simpson لــە ساڵی 1985 پرۆسەیەکی نوێی داهێنا بە ناوی Directional Coronary Atherectomy کــە یەکەم جار لە خوێنبەری ڕانــەوە ئەنجام درا، ئــەم ئامێرە لە توانای دابــوو کە خوێنی مەییوو و چەوری کۆبووەوە و پارچە گەورەکان لاببات لە ناو خوێنبەرەکان، ئەمەش دەرئەنجامێکی باش بوو دواتر Transluminal Arherectomy Cath دیزاین کرا لەلایەن کۆمپانیای stack هەموو ئامانجەکەش ئەوە بوو کەڵەکەبووەکان فڕێ بدات و دەریان بهێنێ لە ڕێڕەوی خوێنبەرەکانی دڵ.

Rotablation لەلایەن David A ئەندازیاری پزیشکییەوە دروست کرا.

یەکەم هەوڵی لەبەکار هێنانی لەسەر مرۆڤ لەلایەن Zacca بوو لە هیوستن.

لە بەرواری 1988/1/6 یەکەم Rotablation لە فەرەنسا ئەنجام درا دوایی لەگەڵ بەکارهێنانی تۆڕ بەکارهێنانی Rotablation کەم بوویەوە بۆ ١٪ ئینجا دواتر تەنها بۆ ئەم نەخۆشانە بەکار دەهات

کە تەسکبوونەوەکانیان بۆ ماوەیەکی زۆر مابێتەوە Calcification، و نەتواندرێ تۆڕیان بۆ دابنرێ.

لە ساڵی 1984 لە فرانکفۆرت دوو پێشەنگ لە بواری کاردیۆلۆجی هەڵسان بە دانانی ROTACS - Rotational Angioplasty Catheterization System و توێژینەوەیەکیان ئەنجام دا نێوان 152 نەخۆش و بۆیان دەرکەوت کە ڕێژەی سەرکەوتن ٪72 لە سەرەتای ساڵانی 1985 لێزەر بەکار هێندرا بۆکردنەوەی ڕێڕەوی خوێنبەرەکان (ئەوانەی کە گیران یاخود تەسکبوونیان هەیە) یەکەم تاقیکردنەوەی ئەنجام دا لەسەر نەخۆشێك کە بە لێزەر کرابوو، بەڵام بۆ سەلامەتیی نەخۆشەکە خوێنبەرێکی تریان چاند بۆی.

ڕێژەی زیانگەیاندن و ڕێژەی دووبارە گیرانەوە بەدی دەکرا بە بەکار هێنانی لێزەر و لە چارەسەر وازیان لەم جۆرە هێنا و بەردەوام بوون لەسەر دانانی تۆڕ.

لەگەڵ ئەو هەموو نوێکارییەی (داهێنانەی) لە پرۆسەی فراوانکردنی خوێنبەرەکاندا بەکار هات، بەڵام دوو کێشەی زۆر سەخت ڕووبەرووی پزیشکان دەبوویەوە لە هەندێ حالەت، ئەوانیش:

١) گیرانی لەناکاوی خوێنبەرێک لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسەکە کە پێویستی بە نەشتەرگەریی فریاکەوتنی چاندنی خوێنبەر دەکرد CABG و بەشێکی زۆر لە ماسولکەکان لە دەست دەدات.

٢) دووباره گیرانەوە Restenosis

دانانی تۆڕ چارەسەر بوو بۆ ئەم دوو کێشەیە. لە ساڵی 1969 Charles Dotter کە بە باوکی cardiology intervention دەژمێردرێ، یەکەم جار هەوڵی دانانی مـاددەی مێتاڵی دا، لە ڕێـڕەوی خوێنبەرەکاندا.



# مێژووی داهێنانی تۆڕی بە دەرمان دەوردراو (Drug Eluting Stent)

لە بەرواری Paule 1986/3/28 یەکەم تۆڕی بەکارهێنا (کە جۆرێکی نوێ بوو و خۆی لێک دەکشا لەگەڵ دیواری خوێنبەرەکە.

سەرەتا بێ کێشە دەڕۆیشت، بەڵام دواتر تووشی کێشەی خوێنمەیین (stent thrombosis) بوونەوە پاشان لەگەڵ بەکارهێنانی دوو دەرمانی خوێن شلکەرەوە نزیکەی 10 ساڵی ویست تا کێشەی خوێنمەیین (stent thrombosis) لە ڕۆژەکانی سەرەتا کۆتایی پێبهێندرێ بەهۆی بەکارهێنانی دژە خوێنمەیین (dual anti platelet) دوو دەرمانی دژە کۆکەرەوەی پەڕەکانی خوێن، ڕێگری لە خوێنمەیین دەکەن.

ئەو بیرۆکەی پێدانی دەرمانی دژە خوێنمەیین (dual anti platelet) لەلایەن Barrgun سەری هەڵدا و تا حەدێک بە شانس بوو!

بەکارهێنانی دوو دەرمانی دژە خوێنمەیین ڕێژەی دووبارە گیرانی کەم کردەوە بۆ ٠,٥٪ هەوڵی دیکە هەبوون وەک (BENESTENT) لە ئەوڕوپا و stress لە ئەمریکا.

ئەو هەوڵانە دەریان خست کە بەکارهێنانی تۆڕی ماددەی مێتاڵی و ئەگەری دووبارە گیران کەم دەکاتەوە.

دواتر لە مانگی نۆی ESC 2001 - ڤییەننا، لە ئەنجامی توێژینەوەیەکی چڕ و گەورە کە لە 238 نەخۆش پێک هاتبوون، لە لایەن (Ravel) خرایەڕوو.

کە جیاوازی نێوان تۆڕی بە دەرمان دەوردراو (drug eluting stent)

و bare metallic باس کرا و کێشەیەک دروست نەبوو بۆ نەخۆشانی تۆڕی بە دەرمان دەوردراو (drug eluting stent).

دواتر جۆری دیکەی زۆری تۆڕ (شبكة) دروست کران بە دەرمانی باشتر دەوردرابوون کە ئامانجەکانی کەمکردنەوەی ڕێژەی خوێنمەیین (stent thrombosis) بوو.

## 1-چارەسەر کردنی نەخۆشیی دەمەوانەکان لەڕێگای پرۆسەی تاڵدانان (قسطرة)

بەکارهێنانی باڵۆن بۆ فراوانکردن و چارەسەری نەخۆشیی دەمەوانەکانی دڵ، لە ساڵی 1979 بۆ تازە لە دایک بووان ئەنجام درا و لە دوای ساڵی 1984 و لە ڕێگای پێستەوە ئەنجام درا.

یەکەم هەوڵەکان بۆ دەمەوانەی چەپی (mitral valve) ئەنجام درا کە تووشی تەسکبوونەوە هاتبوو mitral stenosis.

پرۆسەی فراوانکردنی دەمەوانە تەسکبووەکان بە زۆر جۆر و شێواز ئەنجام درا.

سەرەتا یەک جۆر باڵۆن بەکار دەهات بەڵام دواتر لەبەر تەواو فراوان نەبوون، دوو جۆر بەکار دەهات.

لە ساڵی 1999: یەکەم دەمەوانە لە ئاژەڵاندا دەرهێنرا و بۆ ئاژەڵێک بەکار هات، دەمەوانەکان توانای کارکردنیان لە دەست نەدابوو بێ کێشە.

یەکەم هەوڵ بۆ مرۆڤ لە ساڵی 2000 بە سەرکەوتوویی کە بۆ ٣ نەخۆش ئەنجام درا.

لە 2002 کۆمەڵێ گۆڕانکاری و ئاسانکاری کرا لە ئەنجامدانی پرۆسەکە و بە شێوەیەک کە دەتوانرا دەمەوانەکان لەو شوێنە بچێنن کە پێیان گونجاو بوو.

یەکێکیتر لە نەخۆشی دەمەوانەکان کە پێی دەگوترێ فراوانبوونی دەمەوانەکان (regurgitation) لە ڕێگای پێستەوە بەهۆی تاڵ دانان (قسطرة)ـەوە چارەسەر دەکرا، بەڵام ڕێگای نەشتەرگەری بە باشتر دەزانرێ بە تایبەت لە لایەن(Everest)ــەوە.

## 2- چارەسەری نەخۆشییە زگماکەکان لە ڕێگای پرۆسەی تاڵدانانەوە (قسطرة)

لە ڕێگای ئەم پرۆسەیەوە بۆ یەکەم جار لەسەر منداڵان تاقی کرایەوە بۆ داخستنەوەی ئەو کون یان دەرچانەی لە نێوان گوێچکەلەکاندا هەبوو (ASD) هەروەها چارەسەری تەسکبوونەوەی دەمەوانەکانیشی پێ کرا. ئەم پرۆسەیە ئێستا نەک تەنها لە منداڵان، بەڵکو لە گەورانیش دەکرێ.

پێویستە ئەوەش بخەینە ڕوو کە پێشتر ئەم چارەسەرانە هەموو لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە ئەنجام دەدرا و کارلێکەوتەی زۆری لەگەڵ خۆی دەهێنا، تۆڕ (شبكة)ش بەکاردێ لەو شوێنانەی کە لە خوێنبەرە سەرەکییەکاندا تووشی تەسکبوونەوە هاتوون.

## 3- چارەسەری نەخۆشی Hypertrophic Obstructive ئەستووربوونی ماسولکەکانی دڵ Cardiomyopathy لەڕێگای پڕۆسەی تاڵدانانەوە (قسطرة)

چارەسەرەکان لە ڕێگای دەرمانەوە نەیانتوانی دۆخی ئەو نەخۆشانە باشتر بکەن کە تووشی ئەستووربوونی ماسولکەکانی دڵ بوون (HOCM) و بەهۆی ئەم ئەستووربوونەشەوە ڕێژەی دەرچەی خوێن تووشی تەسکبوونەوە بوون.

بۆیە تاکە ڕێگا نەشتەرگەری بوو بۆ بڕینی ئەو بەشەی ماسولکەکان کە ڕێڕەوەکانیان تەسک کردووە.

1994/6/16 لە لەندەن vlirch sigucut بیرۆکەیەکی نوێی بەکار هێنا بۆ نەهێشتنی ماسولکە زیادەکان، بە ناردنی بڕێک لە دەرمان ethanol و بەشێک ماسولکەکانی لە کار خست (Infarction) و ئەم تەکنیکە پێی دەگوترێ (septal ablation). ئێستا ئەمە زۆر بەکاردێ بە تایبەت لە ئەڵمانیا ئاسانە و بێ کێشەیە و نەخۆشی سوودی لێ دەبینێت.

بە پێشڕەوی و پێشەنگخوازی Andreas R. Gruentzing پڕۆسەی تاڵ دانان لەژێر پێستەوە ئەنجامی باشتری دروست کردووە لە کاردیۆلۆجی.



# پرۆسەی دووبارە ژیانەوەی دڵ

## مێژووی داهێنانی پڕۆسەی دووبارە ژیانەوەی دڵ

مردنی لە ناکاو هەمیشە پرسێکی گرنگ بووە لای پزیشکان. ئێستا لە سەردەمی پێشکەوتوودا هۆکار و پڕۆسەی زانستی هەن کە بۆ نە خۆشێک ئەنجام بدرێن کاتێ کە تووشی لەناکاو ڕاوەستانی دڵ دەبێت، بۆ نموونە مەساجی دڵ و بەکارهێنانی ئامێری کارەبایی (Defibrillator)

## بوژاندنەوەی دڵ و دانانی یەکەی چاودێری چری دڵ

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم هەندێ لە پزیشکان پێشنیاری ئەوەیان کرد کە پڕۆتۆکۆڵێکی تایبەت بە پڕۆسەی ژیاندنەوە/ بوژانەوەی دڵ دابنێن، کە ئەمەش مەبەستیان مەساجی دڵ بوو لە ڕێگای پەستان خستنە سەر بەشێکی دیاری سینگ، بۆ ئەوەی بەردەوامی بدەن بە پڕۆسەی ناردنی خوێن بۆ مێشک و سییەکان.

لە ساڵی 1892 دوو پزیشکی نەشتەرگەر بە ناوەکانی Franz Koeing و Friedrich Maass ئەم شێوازی ژیاندنەوەیان بەکار هێنا بۆ دوو منداڵ لە شێوەی 120 پەستان لە خولەکێکدا.

دواتر لە ساڵی 1903 پزیشکی تر بە ناوی George Crile کە خاوەن ئەزموون بوو و وەک پزیشکی تیمارکەر لە کاتی جەنگی نێوان ئەمریکا

و ئیسپانیا کاری کردبوو، هەڵسا بە دانانی پرۆتۆکۆڵێکی تایبەت بەم پرۆسەیە و هەنگاوەکانی ژیاندنەوە، کە لە کۆی 10 هەوڵ تەنها لە یەک دانایان سەرکەوتوو بوو.

ئەمە کاردانەوەیەکی زۆری هەبوو لە دونیای ئینگلیزەکان و دواتر لە ساڵی 1955 پزیشکێک بە ناوی Maurice Cora یەکەم یەکەی فریاکەوتنی دروست کرد لە پاریس، کە دەیانتوانی بیبەنە ئەو شوێنەی کە پێویستیان پێی بوو.

لە ساڵی 1960 لە زانکۆی John Hopkin کۆمەڵێک پزیشک بە هاوکاری دوو ئەندازیار هەوڵیان دا بۆ دانانی شێوازێکی نوێ، کە ئەمەش تا ئێستا کاری پێ دەکرێ، لە ڕێی پەستان خستنە سەر سنگی ئەو کەسە بە مەبەستی یارمەتیدان لە پرۆسەی ناردنی خوێن.

لە بڵاوکراوەیەکی زانستیدا بە ناوی Massage Closed Chset Cardiac، لە گۆڤاری JAMAئەوەیان باس کردبوو کە پێویستە پەستانەکان لە شێوازی 60 دانە لە خولەکێکدا ئەنجام بدرێ.

دوابەدوای ئەمە، بەکارهێنانی چەندین دەرمان و دەرزی و شۆکی کارەبایی هاوتەریب لەگەڵ ئەم پەستانانە ئەوەیان بەدی کرد کە ئەم پرۆسەیە ڕزگارکەر بووە بۆ 70% ی ئەو نەخۆشانەی بۆیان کراوە.

هەر لە سەرەتای ساڵانی 1960 دوای ئەو بەرەوپێشچوون و دەرئەنجامانەی لەگەڵ پرۆسەی بوژانەوە و مەساجی دڵ بەدی کران، هەوڵ درا کە ئیتر یەکەی تایبەت بە چاودێریی چڕی نەخۆشانی دڵ

ئامادە بکەن.

لە ساڵی 1961 لە گۆڤاری Lancet پزیشکێک بە ناوی Desmond G. Julian بابەتێکی بڵاوکردەوە کە تیایدا ئاماژەی بە گرنگی و ڕۆڵی هەبوونی یەکەکانی چاودێریی چڕی تایبەت بە دڵ کرد، لای وابوو کە نەخۆشەکان دەرئەنجامی باشتریان دەبێ ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی بەردەوام چاودێری بکرێن لە لایەن کەسانی پسپۆر و شارەزاوە.

ساڵێک دوای ئەم بڵاوکراوەیەی، Desmond. خۆی لە ئوسترالیا یەکەم یەکەی چاودێریی دڵی دامەزراند.

دواتر لە ئەمریکا و وڵاتانی تر یەکەکانی چاودێریی دڵ دانرا.

لە ئەمریکا ئەم یەکانە بە هەماهەنگی لەگەڵ یەکەکانی دوای نۆبەی دڵ لە توێژینەوە دابوون بۆ دۆزینەوەی جێکەوتەکانی دوای نۆبەی دڵ و ڕێگرتن لێیان.

دواتر لە نێوان ساڵانی 1962-1965 تەنها لە ئەمریکا نزیکەی 250 یەکە دامەزرێندران.




# میژووی داهێنانی ئامێری
# ترپە ڕێکخەری دڵ

له ساڵی 1872 پزیشکی فەرەنسی Armand D. De Boulogne بۆ یەکەم جار تەزوی کارەبایی بەکار هێنا بۆ ڕزگارکردنی گیانی منداڵێک کە لێدانی دڵی زۆر خاو ببوویەوە، لە ڕێی دانانی پادێکی کارەبایی لە دەستی چەپی و دانەیەکیش لەسەر سینگی.

لە ئەڵمانیا لە ساڵی 1882 یەکەم تاقیکردنەوە کرا لەسەر نەخۆشێک لە لایەن Wilhelm V. Zeimsen کە تەزووی کارەبایی بەکار هێنا بۆ ڕێکخستنەوەی لێدانەکانی دڵی.

هەمان هەوڵ لە ئیتاڵیا لە ساڵی 1903 درا لە لایان M.N. Floresce و دواتر لە وتارێکی زانستیدا بە ناوی (گەڕانەوە بۆ ژیان لە ڕێگای تەزووی کارەباییەوە) باسی گرنگی ئەم هەنگاوەی کرد بەڵام لە هیچ لایەکەوە گرنگ وەرنەگیرا.

لە ساڵی 1928 لە ئوستراليا لە لایەن Mark C. Lidwell منداڵێکی تازە لەدایکبوو هەوڵی گەڕانەوەی لێدانی دلیان بۆ کرد، لە ڕێگای بەکارهێنانی تەزووی کارەباییەوە.

منداڵەکە بۆ ماوەی 10 خولەک ژیانی گەڕایەوە.

ئەم پزیشکە ئەنجامی ئەم کارەی بڵاو نەکردەوە و ترسی هەبوو لە کاردانەوەکانی.

## شێوازی هایمان Hyman's Prototype

لە ساڵی 1932 یەکەم ئامێری ترپەڕێکخەر دروست کرا لە لایان Albert S. Hyman لە نیویۆرک.

ئەم ئامێرە بەکار دەهات بۆ ئەو کاتانەی کە دڵ لە لێدان دەکەوت، لەگەڵ کۆمەڵێک دەرمان. بەڵام دواتر بۆی دەرکەوت کە ناردنی تەزووی کارەبایی لە ڕێگای ئامێرەکەوە بوەتە هۆی گەڕانەوەی لێدانەکانی دڵ.

یەکەم ئامێر کێشەکەی 7.2 کگم بوو. ئەم پزیشکە ئەم ئامێرەی 44 جار لەسەر ئاژەڵ تاقی کردەوە و 14 ئەنجامی باشی بەدەست هێنا.

یەکەم هەوڵی سەرکەوتوو لە لەیان پزیشکێک لە زانکۆی هارڤەرد بە ناوی Paul M.Zoll درا کە لە ساڵی 1950 بوو.توێژینەوەیەکیان کرد لەسەر کۆنەخۆشی Stokes - Adams Syndrome کە بەشێکی زۆر (50%) لە تووشبوان دەمردن لە یەکەم ساڵی تووشبوونیان.

بەپێی ئەو هەوڵانەی کە لەسەر ئاژەڵان تاقی کرابوونەوە لە ساڵی 1952 هەر لە زانکۆی هارڤەرد، پزیشکانی پسپۆری دڵ هەڵسان بە دانانی ئامێرێکی کارەبایی ترپە ڕێکخەر بۆ ئەو نەخۆشانەی کە تووشی نارێکی یاخود وەستانی لێدانی دڵ هاتبوون.

ئامێرەکە بە سینگی نەخۆشەکە دەبەسترا و پادە کارەباییەکانیش لە دەستێک و لایەکی سینگی دادەنران.

ئەمە لەسەر 14 نەخۆش تاقی کرانەوە.

دوای ئەم هاوڵانە، توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر ئامێری ترپە ڕێکخەری دڵ بە چڕی دەستیان پێ کرد.

لە ساڵی 1957 لە زانکۆی Minnesota کۆمەڵێک پزیشک ئامێرێکیان بۆ دڵی نەخۆشێک چاند کە تووشی نەخۆشی Complete Heart Block ببوو و ئامێرەکە بە پیل (پاتری) کاری دەکرد.

هەوڵی زۆر دران لەم بوارە و کۆمەڵێک نەخۆش سوودمەند بوون و هەوڵی پزیشکانی ئەوسا بە فیڕۆ نەچوون.

دیارترین ئەو پزیشکانەی کە ڕۆلیان هەبوو لە دانانی ئامێری ترپەڕێکخەر بۆ نەخۆشەکانیان :-

لە ساڵی 1959 لە پاریس لە نەخۆشخانەی Lariboisiere لە لایەن دوو پزیشک یەکەم هەوڵ درا بە ناوەکانی Yves Bouvrain و Fred Zacouta هـەر لە ساڵی 1959 لە نیویۆرکیش هەوڵ درا لە لایەن Seymour Furman و George Robinson.

دواتر لە ساڵی 1960 تیمە پزیشکییەکەی Zoll داهێنانکاری زۆریان لە ئامێرەکە کرد و بە شێوەیەکی زۆر بچووک و سووک دروست کرا، کە دەکرا لە ژێر پێستی نەخۆش دابنرێ و تاڵە کارەباییەکای بخرێتە ناو دڵەوە.

ئەمە سەرکەوتنێکی گـەورە بوو و دەستکەوتێکی گرنگ بوو لە کاردیۆلۆجی.

## چاندنی ئامێری ترپە ڕێکخەر لە ڕێی نەشتەرگەرییەوە

دوای دروستکردن و داهێنانکاری لەم ئامێرەدا کە بووە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی زانستیی نەخۆشییەکانی دڵ دەژمێردرێت، دەرگای چارەسەر ڕێگری لە زۆر نەخۆشی و کێشەی ناڕێکیی لێدانی دڵ کرانەوە.

بۆ یەکەم جارە ساڵی 1958 لە سوید rune elmquist و ake sending دوو پزیشکی نەشتەرگەری دڵ و سییەکان، ئامێرێکی ترپەڕێکخەریان چاند بۆ نەخۆشێک کە کێشەکەی ٦٠ گرام بوو بە قەبارەی ٦سم. یەکەم نەخۆش کە ئەم ئامێرەی بۆ دانرا ناوی Arne Larson بوو.

## دڵی دەستکرد (The Artificial heart)

'دڵی دەست کرد' ئەو ئامازەیەی هیوای بە بەشی نەشتەرگەری دڵ بەخشی.

دەکرا بۆ ئەم نەخۆشخانە ئەنجام بدرێ کە تووشی پەککەوتنی دڵ بوون.

دوو جۆر هەیە:

1- جۆری دەستکرد بە تەواوی (The total prosthesis)، کە لە شوێنی لە شوێنی دڵە نەخۆشبووەکە دەچێنرا.

ventricular device assist -2، کە ئەمەیان بەشێکی دەچێنرا لەگەڵ دڵی نەخۆشەکە و بەجێ دەهێڵدرا. لە نێوان 1969-2010 نزیکی 900 دڵی دەست کرد چاندرا بۆ نەخۆش لە سەرتاسەری جیهان.

توێژینەوە سەرەتایی و گرینگەکان لەسەر دڵی دەستکرد لە ساڵی 1949 دەستی پێ کرد و لەلایەن Sewell و Glenn لە بەشی پزیشکی(yale) ئاژەڵان.

1960 پرۆگرامێکی چڕی توێژینەوە لەسەر دڵی دەست کرد بەڕێوەچوو لە ئەمریکا لەژێر چاودێریی پزیشکی هۆڵەندی Willem J. Kolff کە هەر خۆی ناوبانگی هەبوو سەبارەتبە گورچیلەی دەست کرد.

لە سەنتەری پزیشکی نیویۆرک Adrian Kantrowitz هەڵسا بە چاندنی دڵی دەستکرد بۆ دوو نەخۆش کە یەکیان لا ساڵی 1965 و دووەمیان لە ساڵی 1966 هەر دوو نەخۆشەکەش کێشەیان نەبوو لەگەڵ دڵە دەستکردەکانیان، بەڵام بە هۆی نەخۆشیی دیکە گیانیان لە دەست دا.

هەوڵێکی تر ئەنجام درا لە پەیمانگای تێکساس/ هیوستن، کە دڵی دەستکرد بە شێوازی دیکە لەوانەی پێشوو بۆ نەخۆش دانرا، باڵام نەخۆشەکە دوای 32 کاتژمێر گیانی لە دەست دا.

لە ساڵی 1982 لە شاری Salt-Lake تیمی پزیشکی William Devries هەڵسان بە چاندنی دڵ بۆ نەخۆشێک لە جۆری Jarvick-7 کە بۆ ماوەی 112 ڕۆژ توانی بێ کێشە لەگەڵی بژی.

ئەم جۆرە پرۆسەیە لە لایەن پزیشکانەوە، گفتوگۆ و ناڕەزایی زۆری

لێ کەوتەوە. بەڵام دواتـر مۆدێلێکی گونجاوتر هاوشێوەی دڵی دەستکرد دانرا لە ساڵی 1984 لە لایەن Devries و ئەو نەخۆشەی تاقیکردنەوەکەی لەسەر کرا بۆ زیاتر لە 620 ڕۆژ بێ کێشە ژیا و دواتر گیانی لە دەست دا.

دواتر لە ساڵی 2001، 2008, هەوڵی نوێتر و گۆڕانکاری لە ئامێرە دەستکردەکانی دڵ کرا و گۆڕانکاری لە کێش و قەبارەی ئامێرەکە ئەنجام درا کە بچووکترینیان بۆ 900 گرام کەم کرایەوە لە لایەن گەورە کۆمپانیاکانی جیهان.




شۆڕشی داهێنانکاری لە دۆزینەوە و
تاقیکردنەوەی کۆمەڵێك دەرمانی تایبەت و نوێ
بۆ نەخۆشییەکانی دڵ

# هەوڵێکی بەردەوام بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵێک دەرمان

:Anticoagulants,thrombolysisandAsprin-1

دەرمانەکانی دژە خوێنمەیین لە ناو ئەوانیش بە تایبەتی هێپارین heparin (کە بەکارهێنانی ئاسانکاری و کاریگەری زۆری کردووە لە دونیای پزیشکی) زۆر بە شانش دۆزرایەوە.

خوێن شلکەرەوەکان ناسران بە دونیای پزیشکی لە سەرەتاکانی سەدەی 20 بەڵام بە شێوەیەکی ڕۆژانە بەکار نەدەهاتن هەتا لە نۆبەی دڵیش، تا ساڵانی 1980 دوای ئەوەی کە کۆمەڵێك توێژینەوەی لەسەر کرا.

دوا بە دوای ئەو ASA کە بە ئەسپرین ناسراوە دیارترین و باوترین جۆری خوێن شلکەرەوەکان لەسەرتا سەری هەموو جیهان بەکار هات لە سەرەتای ساڵی 1980.




چیرۆکی دۆزینەوەی هێپارین لە ساڵی 1912 دەستی پێ کرد، کاتێ قوتابییەکی پۆلی دووەمی کۆلێژی پزیشکی بە ناوی McLean کە لەگەڵ سەرپەرشتیارەکەی William H.Howell بەیەکەوە توێژینەوەیان دەکرد لەسەر پرۆسەی خوێنمەیین، لە تاقیکردنەوەیەکیان سەرکەوتووبوون لە

دۆزینەوەی ئەم دەرمانە کە لە پلازمای خوێنی سەگێکدا دەریانیان هێنا کە بە ڕێژەی 2% تێدابوو.

لە ساڵی 1930 کیمیاگەری سویدی Jonhann E.Jorpes خۆی کیمیای هێپارینی دروست کرد.
لە ساڵی 1935 یەکەم تاقیکردنەوەی هێپارین بۆ مرۆڤ ئەنجام درا و بەکارهات وەك دەرمانی خوێن شلکەرەوە لە کەنەدا لە لایەن Charles Best، دوایی بە شێوەیەکی بەرچاو بەکار هات بە تایبەتی دوای پرۆسەی نەشتەرگەرییەکان بۆ ڕێگریکردن لە کرداری خوێنمەیین و یەکەی ئەم دەرمانە بە (IU) دانرا دواتر دۆزینەوەی دەرمانەکانی تری بە دوای هات کە هەمان کاریان هەبوو. (خوێن شلکەرەوە، ڕێگریکردن لە خوێنمەیین و تۆپەڵبوون) لەوانەی Vit K کە دوای جەنگی جیهانی دووەم بوو.
دواتر لە ساڵی 1982 یەکەم هیپارینی دەستکرد دروست کرا ئەم جۆرەیان ئەو تایبەتمەندییەی هەبوو کە ڕۆژانە یەک جار بەکار دەهات.

## 2- (Asprin) Sali Helix / salix Alba

سۆمەریەکان 5000 ساڵ پێش زاینی و میسرییەکان 2000 ساڵ پێش زاینی گیای Salix یان بەکار هێنا و ورد بوونەتەوە و بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو گیایانەی نزیك ڕووبار سەوز دەبن وەکو Salix helix چارەسەرن بۆ ئەو نەخۆشییانەی کە لە ڕێگەی شێداری تووش دەبن وەکو ڕۆماتیزم. واتا لە بەرواری 1763/4/25، Edward Stone یەکەم بڵاوکراوەی زانستی بڵاوکردەوە لەسەر ترشیە ساڵیسەلیکەکان ASA لە کۆمەڵەی پزیشکی ڕۆیال/لەندەن.

لە ئیتاڵیا لە ساڵی 1825 دەرمانساز Larzia ماددەیەکی دەرهێنا لە ڕووەکی Salialba و تێکەڵی کرد بە کۆمەڵێك ترشی و ناوی نا Salicin، لە فەرەنساش هەوڵی زۆری دا بۆ ڕووەکەکەو زۆریان دەستکەوت و لە مێژووی پزیشکیدا Felix Hoffmann بە باوکی ئەسپرین دەناسرێ. لە 10/10/1897 هەڵسان بە دروستکردنی جۆرێکی خاو و جێگیری ASA و ئەو جۆرەیان بە باشتر هەژمار دەکران، چونکە بەرگی پارێزگاری هەبوو بۆ گەدە.

1899 کۆمپانیای Bayar هەڵسا بە دابینکردنی ئەم دەرمانە و تا ئێستاش بەردەوامە.

ئەسپرین وەک دەرمانی دژەهەوکردن و دژە تا و دژە ئازار بەکار دێت و لە ساڵی 1950 ناوبانگی دەرخست و هەر لەو ساڵەش توێژینەوەی لەسەر کرا کە کار دەکاتە سەر خوێنمەیین و دواتر لە نێوان ساڵانی 1967-1968 بە هۆی نەخۆشێکەوە پزیشکی ئەمریکیLawerence

Carven بۆی دەرکەوت کە ئەسپرین وەك خوێن شلکەرەوە بەکاردێت ڕێگری لە خوێنمەیین دەکات.

ئەسپرین بە یەکێ لەو دەرمانانە دەژمێردرێ کە بە ڕێژەی یەکجار زۆر 40.000 تەن / لە ساڵێک بەکاردێ.

## 3- مێژووی دۆزینەوەی دەرمانی دابەزێنەری ڕێژەی چەوری.

بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1758 پزیشکی فەرەنسی کۆڵسزترۆڵی بە دونیای زانستی ناساند.

دواتر قۆناغ بە قۆناغ زانیارییەکان لە سەر فۆرمی کیمیای پێکهاتە و جۆرەکانی و بەندبوونیان بە پرۆتینەکانی ناو خوێنەوە و ڕۆڵی کۆڵسترۆڵ لە نەخۆشی کەڵەکەبوونیان لە ناو خوێنبەرەکانی دڵدا توێژینەوەی لەسەر کرا.

لە سەدەی 20 نزیکەی 10 نۆبڵ درا بەو کەسانەی کە لەبارەی کۆڵسترۆڵ دۆزینەوەیان ئەنجام دا.

لە دوای ساڵی 1950 کە ڕێژەی بەرزی چەوری بوو بە یەکێ لە فاکتەرەکانی تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دڵ ناسێنرا و گرنکی بە ڕۆڵی پارێزگاریکردن لێی کرا.

لە دوای ساڵی 1970 پزیشکان هەوڵیان دا لە ڕێی چۆنییەتی ژیان و گۆڕانکاری لە خواردنی ڕۆژانە گۆڕانکاری لە ڕێژەی کۆڵسترۆڵ لە لەشی مرۆڤ بکەن، دواتر وەک پارێزگاری، کۆمەڵێک دەرمانیان

داهێنا کە ڕێژەی چەورییەکان و جۆرەکانی کۆلێسترۆڵیان ڕێکدەخست
کە پێیان دەگوترا Lipid Lowering Agents.

لە بەرواری 1928/8/17 لە بۆستن، دوو پزیشک بە ناوەکانی Robert E. Gross و John P. Hubbard یەکەم نەشتەرگەری دڵیان بە سەرکەوتوویی ئەنجام دا بۆ منداڵێکی تەمەن 7 ساڵان.

ئەم هەوڵە بە یەکەم نەشتەرگەریی دڵ دەژمێردرێت لە مێژووی کاری نەخۆشییەکانی دڵدا، بە خاڵێکی وەرچەرخان هەژمارکرا و بەرپرسی AHA ی ئەو کات هەردوو پزیشکەکەی خەڵاتکردن و ڕۆڵیانی بەرز نرخاند و مەدالیای ڕێزلێنانی پێشکەش کردن و پێی وابوو کە ئەم پرۆسەیە کلیلی دەرگایەکی گەورەیە بۆ بەشی نەشتەرگەرییەکانی دڵ.

دواتر لە ساڵی 1944 لە ستۆکهۆڵم پرۆسەیەکی تری نەشتەرگەری Coartation of Aorta بۆ نەخۆشێکی تر ئەنجام درا لە لایەن Clarence Crafoord و Carl Gastav Nylin، دواتر ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ نەخۆشییەکانی دڵ زیاتر پەرەی پێ درا و بە شێوەیەکی زیاتر ئەنجام دەدرا، بە تایبەت بۆ ئەو نەخۆشییانەی کە زگماگ بوون، پێویست بوون لە تەمەنی منداڵی چاککردنەوە لە ڕێگای نەشتەرگەرییان بۆ بکرێت.

## مێژووی سەرهەڵدانی نەشتەرگەریی چاندنی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری - CABG

نەشتەرگەری دڵ و گۆڕینی خوێنبەرەکانی دڵ بە کرۆکی بەشی نەشتەرگەریی دڵ دەژمێردرێ، ئەو سەردەمانەی کە پرۆسەکانی تاڵدانان و فراوانکردنی خوێنبەرەکان لە ڕێگای تۆڕ دانان و باڵۆنەوە (قسطرة و شبكة و بالون) ئەنجام نەدەدرا، تاکە ڕێگای ڕزگارکەری نەخۆش لە تاو ئازاری سنگ و تەنگەنەفەسی لە کاتی ڕۆیشتن، بە هۆی گیران و تەسکبوونەوەی خوێنبەرەکانەوە، تەنها و تەنها لە ڕێگای نەشتەرگەریی چاندنی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری CABG ەوە ئەنجام دەدرا.

یەکەم هەوڵی لە کەنەدا درا لە لایەن Arthur M. Vinerbeg ـەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

پزیشکان زیاتر کاریان لەسەر چۆنییەتی ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە کرد بۆ ئەوەی کەمترین جێکەوتەی خراپ بۆ نەخۆشەکە دروست ببێ.

دواتر لە بەرواری 2-5-1960 یەکەم هەوڵی چاندنی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری لە ڕێگای نەشتەرگەریی دڵەوە -فتح الصدر- ئەنجام درا لەلایەن پزیشکی نەشتەرگەر Robert H.Goetz، کە تیایدا نەخۆشەکە بۆ ماوەی ساڵێک تووشی ئازاری سینگ نەبوویەوە و سوودی لە نەشتەرگەرییەکە بینی.

ئەم هەنگاوەی ڕۆبێرت بە یەکێ لە هەنگاوە زۆر بوێرانەکان

دەژمێردرێ، چونکە توانی سەرکەوتوو بێت لە ئەنجامدانی پڕۆسەیەکی زۆر مەترسیدار.

دواتر بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو ئەم پڕۆسەیە ئەنجام دەدرا، تا ئەو کاتەی کە پزیشکانی دڵ توانیان پڕۆسەی تاڵدانان و شبکە و بالون بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدەن.

لە دوای ئەمەشەوە و تا ئێستاش نەشتەرگەریی چاندنی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری تەنها بۆ ئەو نەخۆشانە ئەنجام دەدرێ کە دانانی تۆڕ و باڵۆن (شبکة و بالون) سوودی نابێت بۆ نەخۆشەکە.

## مێژووی ئەنجامدانی یەکەم نەشتەرگەری بۆ دەمەوانەکانی دڵ - الصمام القلب.

هەبوونی ئەو نەخۆشییانەی کە پەیوەست بوون بە دەمەوانەکانی دڵ و پێویستی نەشتەرگەری بۆیان، وای کرد بیرۆکەی چاککردنەوەی یاخود گۆڕینی دەمەوانەکانی دڵ، سەر هەڵ بدات.

سەرەتای بیرۆکەکە بە شێوەی لاوەکی هەڵسەنگێندرا لە سەرەتای ساڵانی 1953 پزیشکێک بە ناوی John Gibbon لە ویلایەتی فیلادلفیا، یەکەم هەوڵی دا و سێ لە چوار نەخۆشی گیانیان لە دەست دا و هیچیتر نەشتەرگەری ئەنجام نەدایەوە.

دواتر پزیشکێکی تر لە ساڵی 1959 پڕۆسەی فراوانکردنی دەمەوانەکانی (Mitral valve stenosis) ئەنجام دا بە سەرکەوتوویی و تا ئیستاش ئەم پڕۆسەیە ئەنجام دەدرێ.

دوای هـەوڵ و وردبـــوونـــەوەی زیـاتـر لـە ساڵی 1960 دوو پزیشکی نەشتەرگەر لە ئەمریکا بە ناوەکانی Albert Star و Lowell Edwards

توانیان یەکەم نەشتەرگەریی گۆڕینی دەمەوانەکانی دڵ ئەنجام بدەن، لە ڕێگایکردنەوەی سینگی نەخۆشەکە -فتح الصدر.

دەمەوانەکان دروست کرابوون و بۆ نەخۆشەکە چێندران و پێویستی دەکرد ئەم نەخۆشانە بە درێژایی تەمەنیان دەرمانی خوێن شلکەرەوە وەربگرن بۆ ئەوەی تووشی خوێنمەیین نەبن.

دواتر لە ساڵی 1962 پزیشکانی ئینگلاند هەوڵیان دا ڕێگای نوێتر بەکار بێنن بۆ ئەنجام دانی گۆڕینی دەمەوانەکانی دڵ و سەرکەوتوو بوون.

پزیشکێک بە ناوی Alfred Gunning توانی دەمەوانەی مرۆڤ بەکار بهێنێتەوە و بیچێنێتەوە بۆ نەخۆشەکە خۆی.

ئەم پڕۆسەیە پێی دەگوترا Ross procedure کە تا ئێستاش بەکار دێت بۆ گۆڕینی دەمەوانەی دڵ (Aortic Valve)

## مێژووی 7 دڵی کەسێک بۆ کەسێکیتر

بیرۆکەی چاندنی دڵی کەسێک بۆ کەسێکیتر لەوەوە سەریهەڵدا، کە پزیشکان ئیدی پێیان وابوو، ئەمە تاکە ڕێگایە بۆ ئەوەی نەخۆشەکە سوودی لێ ببینێت.

سەرەتا وەک بەرچاوڕوونیەک لەسەر ئاژەڵ تاقییان کردەوە لە سەرەتای ساڵی 1946، دواتر هەوڵەکان بەردەوام بوون تا ساڵی 1967 کە لە ئەفریقای باشوور لەلایەن پزیشکی نەشتەرگەر .Christaan N Barnard یەکەم جار لەسەر مرۆڤ ئەنجامی دا و نەشتەرگەرییەکە زیاتر لە ٥ کاتژمێری خایاند.

ئەمە بە یەکەم هەوڵی سەرکەوتووی نەشتەرگەری چاندنی دڵ دەژمێردرێت.

هەروەها بە خاڵێکی گرنگ لە بواری نەشتەرگەری لە سەدەی بیستەمدا دەژمێردرێت.

دواتر لە ساڵی 1968 بۆ نەخۆشێکی تریشی ئەنجام دا و توانی بۆ ماوەز زیاتر لە 20 مانگ بێ کێشە بژییێت.

هەوڵەکان بەردەوام بوون و وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکاش دەستیان بە ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیە کرد، لە ماوەی ساڵێکدا توانیان 102 نەشتەرگەری چاندنی دڵ ئەنجام بدەن لە هەموو جیهان بەڵام 60% ..ی نەخۆشەکان دوای نەشتەرگەرییەکە گیانیان لە دەست دا

خۆشبەختانە بە گۆڕانکاری و داهێنانی تەکنیکی نوێ، توانرا تا ساڵی 1991، لە هەموو جیهان 15,995 نەشتەرگەریی چاندنی دڵ ئەنجام بدرێ و ڕێژەی سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکە 80% بوو.

شایەنی باسە کە Norman Shumuay بە یەکێ لە پێشەنگانی نەشتەرگەریی چاندنی دڵ هەژمار دەکرێ و ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە داهێنانکاری و بەرەوپێشچوونەکان لەم بوارەدا.

بە پێویستمان زانی تیشک بخەینە سەر ئامارەکانی پرۆسەی چاندنی دڵ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، لە چەند وڵاتێکی جیهان لە ماوەی 10 ساڵی ڕابردوودا.

1- ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ماوەی 10 ساڵی ڕابردوودا 28660 پرۆسەی چاندنی دڵی ئەنجام داوە، واتە بە ڕێژەی 2866 پرۆسە لە هەر ساڵێکدا.

2- بەریتانیا لە ماوەی 10 ساڵی ڕابردوودا 1771 پرۆسەی چاندنی دڵی ئەنجام داوە، واتە بە ڕێژەی 177 پرۆسە لە هەر ساڵێکدا.

3- ئەڵمانیا لە ماوەی 10 ساڵی ڕابردوودا 3224 پرۆسەی چاندنی دڵی ئەنجام داوە، واتە بە ڕێژەی 322 پرۆسە لە هەر ساڵێکدا.

4- تورکیا لە ماوەی 10 ساڵی ڕابردوودا 789 پرۆسەی چاندنی دڵی ئەنجام داوە، واتە بە ڕێژەی 78.9 پرۆسە لە هەر ساڵێکدا.

5- ئێران لە ماوەی 10 ساڵی ڕابردوودا 635 پرۆسەی چاندنی دڵی ئەنجام داوە، واتە بە ڕێژەی 90 پرۆسە لە هەر ساڵێکدا.

6- سعودیە لە ماوەی 10 ساڵی ڕابردوودا 281 پرۆسەی چاندنی دڵی

ئەنجام داوە، واتە بە ڕێژەی 28 پرۆسە لە هەر ساڵێکدا.

پرۆسەی چاندن دڵ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر  بە بەردەوامی لەسەر ئاستی جیهان ئەنجام دەدرێ و بە شێوەیەکی گشتی سەرکەوتنی بەرچاوی هەیە.



# پێشکەوتنە بەرچاوەکان لە پرۆسە نیمچە - نەشتەرگەرییەکانی دڵ

دوابــەدوای بەرەوپێشچوونی زۆر لە کاردیۆلۆجی، پزیشکان و نەشتەرگەرانی دڵ هەمیشە لە هەوڵی ئەوە بوون کە پڕۆسەکانی نەخۆشییەکانی دڵ کەمترین جێکەوتەی هەبێت بۆ نەخۆش

بۆیە بۆ بەشێکی زۆر لە پڕۆسەکان هەمیشە لە دوای ئەڵتەرناتیڤێک بوون، بۆ ئەوەی کەمترین ڕێژەی نەشتەرگەریی کردنەوەی سینگ ئەنجام بدەن.

خۆشبەختانە زانستی نەخۆشییەکانی دڵ لە سەدەی 21 گەیشتووەتە ئەو لووتکەیەی کە هەوڵیان بۆی دەدا.

چەندین پڕۆسەی نوێیان داهێنا و هێنایانە ناو دونیای کاردیۆلۆجی بە شێوەیەکی پراکتیکی و بوونە هۆی ئاسانکاری زۆر لە کاردیۆلۆجی و نەشتەرگەری دڵ و سییەکان.

پێمان باشە لەم بەشەدا تیشک بخەینە سەر دوایین ئەو پڕۆسە نوێیانە و ئاشناتان بکەین پێیان.

## 1- پرۆسەی TAVI / TAVR

ئەم پرۆسەیە - Transcatheter Aortic Valve Implantation هەروەها پێشی دەگوترێ Transcatheter Aortic Valve Replacement بەکاردێ بۆ چاندن یاخود گۆڕینی یەکێ لە دەمەوانەکانی دڵ (الصمام الأبهري) لە ڕێگای پرۆسەی تاڵدانان - قسطرة وە. بە تایبەت ئەوانەی تووشی تەسکبوونەوەی ئەم دەمەوانە بوون بە شێوەیەکی زۆر (Sever Aortic stenosis)

پێشووتر کرداری گۆڕینی دەمەوانەکان بە نەشتەرگەری ئەنجام دەدرا و سینگی نەخۆشەکە شەق دەکرا و وای پێویست دەکرد کە ئامێری دەستکردی دڵ-سییەکان بۆ نەخۆشەکە بەکاربێت بۆ پرۆسەی سووڕی خوێن تا نەشتەرگەرییەکە تەواو دەبوو.

بەڵام دوا بە دوای داهێنانی ئەم پرۆسەیەوە پێویست بە دانانی ئەم ئامێرە ناکات و دەمەوانەکانی نەخۆشەکە دەگۆڕدرێن و دەچێندرێن لە ڕێگای ناردنیان بۆ ناو دڵ لە ڕێگای برینێکی بچووک لە سنگەوە و دواتر تاڵ (وایەری تایبەت) دەنێردرێتە ناو دڵی نەخۆشەکە و دەمەوانەکان دەچێندرێن.

ئەم پرۆسەیە لەگەڵ ئەوەی جێکەوتەکانی دوای نەشتەرگەری کەم کردەوە، دەتوانرێ بۆ ئەم نەخۆشانە ئەنجام بدرێ کە باری تەندروستییان ڕێگا نادات نەشتەرگەری ئەنجام بدەن و سوودی زۆر لەم پرۆسەی TAVI دەبینن.

یەکەم پزیشک کە ئەم پرۆسەی ئەنجام دا بۆ یەکەم جار، ناوی Alain Cribier بوو سەر بە زانکۆی Charles Nicolle لە /Rowen France بوو، لە بەرواری 2002/4/16.

تا ئێستاش و بە ڕێژەیەکی فراوان کرداری گۆڕینی دەمەوانەکانی دڵ لە ڕێگای پرۆسەی TAVI ئەنجام دەدرێت.



## -2 پرۆسەی Mitral Clipping




کەمترین نەشتەرگەری، کەمترین جێکەوتە بۆ نەخۆش و سوودی زیاتر و هەمان ئەنجام!

ئەمە ئەو ئامانجەبوو کە پزیشکان هەوڵیان بۆ دەدا.

داهێنانێکی تری سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەم ئەم پرۆسەیە بوو.

لە ڕێگای Mitral Clipping ەوە هەوڵی چاککردنەوەی ئەو دەمەوانەی دڵ دەدرا کە کێشەی داخستنیان هەبوو. (Mitral Regurgitations) کاتێ کە دەمەوانەکان بە تـەواوی دانەدەخستران - شلبونەوە - نەخۆشەکان تووشی کۆمەڵێ نیشانە دەبوون، لەوانە تەنگەنەفەسی، سەرسووڕان یاخود ژانی سینگ.

بۆیە پێویست بوو لە ڕێگای پرۆسەیەکەوە ئەو بەشەی کە تەواو داناخرێ، چاک بکرێتەوە لە ڕێگای بەکارهێنانی کلیپێک بۆی.

سـەرەتـای دانانی کۆنسێپتەکە بۆ کۆتاییەکانی ساڵانی 1990 دەگەڕێتەوە، بەڵام زیاتر کاری لەسەر کرا، تا ساڵی 2003 کە تیمی ئەندازیاری Evalae بە هەماهانگی لەگەڵ پزیشکی کاردیۆلۆجست Fred St.Goar توانیان بۆ یەکەم نەخۆش ئەم پرۆسەیە ئەنجام بدەن بێ کێشە.

تا ئێستاش ڕێژەی ئەنجامدانی ئەم پرۆسەی Mitral Clipping بە شێوەیەکی بەرچاو سەرکەوتنی بە دەست هێناوە.

## 3 - ئامێری LAA Occluder

ئەوانەی کە تووشی نەخۆشی لەرزینی گوێچکەڵەیی (رجفان الأذيني) هاتوون و هۆکارەکەش دەمەوانەکان نین و وەک یەکێک لە ڕێگاکانی چارەسەر پێویستە کە دەرمانی خوێن شلکەرەوە وەربگرن بۆ کەمکردنەوەی مەترسی ڕوودانی نۆبەی مێشک.

پزیشکان لە دوای ڕێگاچارەیەک دەگـەڕان کە ڕێگری بکەن لە کەڵەکەبوونی خوێن و مەیینی لە بەشێکی بچووکی گوێچکەڵەی لای چەپ، چونکە بەشێکی زۆریان تووشی نۆبەی دڵ دەبوون.

بۆیە وەک ستراتیجییەکی نوێ لە چارەسەر، هەڵسان بە دانانی ئامێرێک کە پێی دەگوترا LAA Occluder لەو بەشەی گوێچکەڵەی چەپ کە نەهێڵێت چی تر خوێنمەین ڕوو بدات و نەخۆشەکەش پێویستی بە بەکارهێنانی دەرمانی خوێن شلکەرەوە نەبێت (تا کۆتایی تەمەنی)، زیاتر بۆ ئەو نەخۆشانە بەکار دێ کە لەگەڵ بەکارهێنانی دەرمانی خوێن شلکەرەوە تووشی خوێنبەربوون بوون و ناتوانن بەردەوام بن لەسەری.

ئامێرەکە بە ڕێگەی تاڵ دادەندرێ و لە ژێر ڕۆشنایی تیشک - بۆ دیاریکردنی وردی شوێنی ئامێرەکە.

یەکەم ئامێر لە ساڵی 2015/3/13 داندرا.

لە توێژینەوەیەکی زانستیدا لەسەر ئەو نەخۆشانەی کە ئامێری LAA Occluder یان بۆ دانرابوو ئەو ئەنجامانە دەست کەوتن:-

- نزیکەی 29% ی نەخۆشەکان توانیان چیتر وارفارین (خوێن شلکەرەوە) وەرنەگرن لە دوای ٥٤ ڕۆژ دوای دانانی ئامێرەکە.

- نزیکەی 99%ی نەخۆشەکان توانیان دەرمانی وارفارین (خوێن شلکەرەوە) وەرنەگرن لە دوای ساڵێک دوای دانانی ئامێرەکە.

ئەم ئەنجامانە ئەوەیان پشتڕاست کردەوە و کە دانانی ئەم ئامێرە بۆ کەمکردنەوەی مەترسی نۆبەی مێشک بە هۆی کەڵەکەبوون و مەیینی خوێنەوە- هۆکارێکی سەرکەوتوو بووە و نەخۆشەکان پێویستیان بە دەرمانی خوێن شلکەرەوە نەبووە.

دوای ئەوەی کە ئامێرەکە لە دڵی نەخۆشەکە چاندرا، دوای ماوەیەک خۆی لەگەڵ شانەکان و دیوی ناوەوەی ماسولکەکانی دڵ یەک دەگرێ Endothelializes و پێویستی بە دەرهێنان نییە.

# چاندنی تۆڕ لە ناو خوێنبەرەکانی لەش

بەشێکی تر لە شۆرشی داهێنانکارییەکانی کاردیۆلۆجی، بریتی بوو لە چاندنی تۆڕ لە بەشی ناوەوەی ئەو خوێنبەرانەی کە دیوارەکانیان تووشی کێشە هاتبوون یاخود ڕێڕەوەکانیان تووشی تەسکبوونەوە هاتبوون.

تۆڕە دروستکراوە-چێندراوەکە لە مادەیەکی تایبەت Metal Mesh پێک دێ و قەبارە و دیزاینەکەی بە گوێرەی قەبارە و جۆری خوێنبەرەکە دادەنرا.

پێمان باشە تیشک بخەینە سەر ئەو دوو جۆرە چارەسەرە گرنگەی کە بەم شێوازە ئەنجام دەدرا، ئەوانیش بریتین لە:-

i - Endovascular Aortic Aneurysm Repair –EVAR

ii - Carotid stents



## یەکەم/ EVAR

ئەم پڕۆسەیە تایبەت بۆ ئەو نەخۆشانە ئەنجام دەدرێ کە تووشی فراوان بوونێکی زۆری نائاسایی هاتوون لە بەشێکی شادەمار، بەو واتایەی کە دیوارەکانی شادەمار فراوان دەبن و تەنک دەبنەوە و مەترسی تەقینی ئەو بەشەی شادەمارەکە هەیە.

بەشە فراوانبووەکە شێوەی توورەگە-کیسێک وەردەگرێ، کە هەندێ جار مەترسی کەڵەکەبوون یاخود مەیینی خوێنیشی هەیە.

تۆرەکە دەچێندرێت بە ڕێگای نیمچە نەشتەرگەریی بچووک، و ناردنی تۆڕەکە لە ڕێی تاڵی تایبەتەوە دەبێت، لەو بەشەی کە فراوان بووە و مەترسی تەقینی هەیە، بە شێوەیەکی هەمیشەیی و پێویستی بە لابردن نییە.لە ڕێگای ئەو تۆڕەوە ڕێڕەوی شادەمارەکە ئاسایی دەبێتەوە.

پێشووتر ئەم پڕۆسەیە لە ڕێگای نەشتەرگەریی گەورە ئەنجام دەدرێ.

لە سوودە زۆر دیارەکانی ئەم پڕۆسەیە ئەوەیە کە:-

- ماوەی مانەوەی نەخۆشەکە لە نەخۆشانە کەمترە و زووتر چاک دەبنەوە و دەکرێ دەست بە ژیانی ئاسایی خۆیان بکەن دوای ٤ هەفتە.

- پڕۆسەکە نیمچە- نەشتەرگەریی بچووکە و مەترسییەکانی نەشتەرگەریی گەورەی لەسەر نییە.

خوێنبەری کارۆتید، بە یەکێک لە خوێنبەرە سەرەکییەکانی بەشی مل دەژمێردرێ کە خوێن دابین دەکات بۆ مێشک.

وەکو هەر خوێنبەرێکی تر، کارۆتیدیش لە مەترسی ئەوەدایە کە لە ڕێڕەوەکانیاندا چەوری کەڵەکە ببێت، تووشی گیران یاخود تەسکبوونەوەی ڕێڕەوەکانیان ببن.

لە هەبوونی حاڵەتێکی وا (تەسکبوونەوەی ڕێڕەوەکان) خوێنی پێویست ناگاتە مێشک و مەترسی ڕوودانی نۆبەی مێشک زیاد دەکات.

لە ڕێگای پرۆسەی فراوانکردنی خوێنبەری کارۆتید و دانانی تۆڕ بۆی (هاوشێوەی خوێنبەرەکانی کۆرۆنەری -دڵ) دەکرێ ڕێگری لە ئەگەری ڕوودانی هەر کێشەیەک بکرێ، بە ڕێژەیەکی بەرچاو.

لە ڕێگای تاڵی تایبەتەوە (قسطرة) ئەو بەشەی کە ماددەی کەڵەکەبووی تێدایە و ڕێڕەوەی تەسک کردۆتەوە، بالوون دەکرێ و فراوان دەکرێ، دواتر تۆڕی تایبەتی بۆ دادەنرێ، ئەویش هەر لە ڕێگای قسطرة و تاڵی تایبەتەوە و دەنووسێنرێ بە دیوارەکانی خوێنبەری کارۆتید و ڕێگری دەکات لە تەسکبوونەووی ڕێڕەوەکەی، بەمەش هاتوچۆی خوێن بە شێوەیەکی ئاسایی دەبێت.

## ئەم پرۆسەیە بۆ کێ ئەنجام دەدرێ؟

بە شێوەیەکی گشتی بۆ سێ گرووپ نەخۆش ئەنجام دەدرێ:-

یەکەم / ئەگەر هاتوو بە رێژەی 70% رێرەوەکەی تەسک ببووەوە.

دووەم / نەخۆشێک کە تووشی دووبارە گیران Restenosis بێتەوە لە دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆی.

سێیەم / بۆ ئەو نەخۆشانەی کەوا شوێنی گیرانەکەیان زۆر هەستیارە و ناکرێ بە شێوازی نەشتەرگەری بۆی ئەنجام بدرێ.

ئەم وێنە جیاوازی نێوان چۆنییەتی فراوانکردنی خوێنبەرەکە پیشان دەدات، لە رێگای نەشتەرگەری و لە رێگای Carotid angioplasty and stenting.

* دوای ئەنجامدانی هەر یەک لەم پرۆسە نیمچە نەشتەرگەرییانە، پێویستە نەخۆشەکە گۆڕانکاری لە شێوازی ژیانی خۆی ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی تووشی هەمان کێشە نەبێتەوە.


Carotid arteries
located in the neck
A
B
C
Internal
carotid
artery
Plaque
Common
carotid
artery
Reduced blood flow
Plaque
Narrowed artery
Incision (cut)
in artery wall
Plaque
removed
by surgeon
Normal
blood flow
restored
Incision
stitched
to repair
the artery
Normal blood flow
restored

له سەدەکانی پێشوو، پزیشکان باوەڕیان وابوو کاتێ کە بەشێک لە ماسولکەکانی دڵ لە کار دەکەوتن بە هۆی نۆبەی دڵەوە، ناتوانن بگەڕێنەوە باری ئاسایی خۆیان و کرداری گرژبوون و خاوبوونەوەی دروست ئەنجام بدەن.

بەلام لە دەیەکانی ڕابردوو هەوڵی دووبارە ژیاندنەوەی ئەو ماسولکانە درا کە لە کار کەوتبوون لە ڕێگای چاندنی خانەی خۆیی Stem Cell. ڕێگایەکی نوێ بوو کە بە کار دەهات بۆ گەڕاندنەوەی کارکردنی ماسولکەکانی دڵ، ئەم خانە خۆییانە لە نەخۆشەکە وردەگیران و دواتر گەشەیان پێ دەکرا و دەشرانەوە نەخۆشەکە بە شێوازی تایبەت. خانەکان هێز و توانای کارکردنیان بۆ ماسولکەکانی دڵ دەگەڕاندەوە و پرۆسەی ژیاندنەوەی ماسولکەکانی دڵ **دروست دەبوون New Muscularization زیاتر بۆ ئەم نەخۆشانە** بەکار دەهات کە بە هۆی نۆبەی دڵ، یاخود پەککەوتنی دڵ کارکردنی ماسولکەکانی دڵی سست ببوون.

## ڕێگاکانی پێدانی Stem Cell

-بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ماسولکەکانی دڵ دەدران، لە کاتی نەشتەرگەری (Intra myocardial)

-ناردنی خانەکان لە ڕێگای خوێنبەرەکانی کۆڕۆنەری (Intra

(coronary

- لە هەندێک سەنتەر لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسەی تاڵدانان (قسطرة) ڕاستەوخۆ بەکار دەهات و ئەمەش بەشە لەکارکەوتووەکەی زووتر چاک دەکردەوە و کارکردنی ماسولکەکانی دڵی باشتر دەکرد.

*ئێستا لە سەرانسەری هەموو جیهان زۆر کەمتر لە پێشوو ئەم پرۆسەیە ئەنجام دەدرێ.

## 5- کەویکردن Cath Ablation

یەکێکیتر لە ڕێگا نوێیەکان بۆ چارەسەرکردنی کۆمەڵێک نەخۆشیی دڵ، بریتییە لە (کەویکردن -Cath Ablation) ئەنجام دەدرێت بۆ ئەو نەخۆشانەی کە نارێکی لێدانی دڵیان هەیە و نیشانەکانی وەک دڵەکوتە، تەنگەنەفەسی..هتد، کاریگەری لەسەر کوالێتی ژیانیان دەکات.

پرۆسەکە لە ڕێگای تاڵدانان (قسطرة) دەبێت، کە وایەرێکی تایبەت دەنێردرێتە دڵ، لە ڕێگای پێستەوە و چالاکییە کارەباییەکانی دڵ تۆمار دەکات، و دواتر ئەو بەشەی دڵ کە کارەباییاتی زیاد دەردەدات دەستنیشان دەکرێ و کەوی دەکرێ، بەو واتایەی وەک برینێکی لێ دەکرێ بۆ ئەوەی تەزووی کارەبایی لەم بەشە نەمێنێت و نارێکی لە لێدانی دڵ دروست نەبێت.

پرۆسەیەکە کاتی کەمی دەوێ و نیمچە نەشتەرگەرییە و نەخۆش بێ هۆش ناکرێ و بە دوور دەبێ لە جێکەوتەکانی مادەی بێهۆشکەر.

وە ماوەی مانەوە لە نەخۆشخانەی کەمە و نەخۆش دەتوانی هەمان ڕۆژ لە نەخۆشخانە دەربچێت و دەکرێ دوای ٢-٣ ڕۆژ بگەڕێتەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆی.

پێویستە ئەوە لای نەخۆش ڕوون بێت کە ڕەنگە تا بۆ ماوەی ٦-٨ هەفتە، هەست بە هەندێ نیشانەی وەک دڵە کوتە بکات، ئەمە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات خۆی نامێنێت.

لە یەکێک لە توێژینەوە زانستییەکان کە لە **British Heart Foundation** بڵاو کرایەوە، ئەوەیان خستە ڕوو کە نزیکەی 90٪ ی ئەو پرۆسانەی ئەنجام دەدرێن، سەرکەوتوون و نەخۆشەکە بە ڕێژەیەکی بەرچاو ڕزگاری دەبێت لەو نیشانانەی کە پێشووتر هەیبوو.

## سەرچاوەکان:


- Major Advances in Cardiology by Michel BERTRAND, MD and Christian REGNEIR, MD
- Stem cell therapy for heart disease by Shannon B Puliafico, Marc S Penn, Kevin H Silver
- Evolution of the concept and practice of mitral valve repair by Lawrence H Cohn, Vakhtang Tchantchaleishvili, Taufiek K Rajab
- Robert H. Goetz: the surgeon who performed the first successful clinical coronary artery bypass operation by Igor E. Konstantinov
- The place of avicenna in the history of medicine by Jamal Moosavi

- Ibn al-Nafis (1210-1288): the first description of the pulmonary circulation By Marios Loukas , Ryan Lam, R Shane Tubbs, Mohammadali M Shoja, Nihal Apaydin

- -Appendage obliteration to reduce stroke in cardiac surgical patients with atrial fibrillation by J L Blackshear, J A Odell

- -TAVI and the future of aortic valve replacement by Callum Howard , Lucas Jullian , Mihika Joshi , Arish Noshirwani , Mohamad Bashir , Amer Harky

## کورتەیەک لە ژیانی نووسەر:

دەرچووی کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر لە ساڵی 2000-1999

دکتۆرا لە نەخۆشییەکانی دڵ و هەناو-ئەڵمانیا

دکتۆرا لە نەخۆشییەکانی دڵ (قسطرة) و دانانی ئامێری ترپەڕێکخەری دڵ - ئەڵمانیا

دکتۆرا لە جۆرەکانی تۆڕ (شبكة) و فراوانکردنی خوێنبەرەکانی دڵ - ئەڵمانیا

ڕاهێنراو لە سەنتەری تایبەت بە چارەسەرکردنی نەخۆشیی پەککەوتنی دڵ (ئیسپانیا) و نەخۆشیی بەرزیی فشاری خوێن لە سییەکان لە ئیتاڵیا، لەسەر دەستی پڕۆفیسۆر گالی

ڕاهێنراو لە نەخۆشخانەی ڕۆیال برۆمپتۆن لە لەندن، لەلایان پڕۆفیسۆر کریستۆف نین ئابر، بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی دانانی تۆڕ بۆ شادەمار EVAR

بەشداربووییەکی چالاک بووە لە کۆنگرەکانی نەخۆشییەکانی دڵ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا-واشنتۆن، شیکاگۆ، لۆس ئەنجلس و هیوستن

بەشداربووییەکی چالاک بووە لە کۆنگرەکانی نەخۆشییەکانی دڵ لە تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن

## ئەو توێژینەوە زانستیانەی کە ئەنجامی داون:

1-Efficacy and safety of Promus-Stent in comparison with Cypher,Taxus and Endeavor Stents in Ischemic Heart Disease Patients with 6 months follow up.

2-Impaired mobilization of CD133(+) bone marrow -derived circulating progenitors with an increased number of Diseased coronay arteries in IHD patients with DM

3-Enhanced mobilization of the bone marrow- derived circulating progenitor cells by Intra coronary freshly isolated bone marrow cell transplantation in patients with Acute Myocardial Infarction

4-Coronary Artery Disease among patients younger than 35 years od Age: Exploring the most common risk factors

5-Reduced number AMI cases at the time of lockdown during the COVID-19 Pandemic in Northern Iraq:Exploring the Possibile explanations Behinde.

6-The most common additional risk factors of CAD in smoker patients Specifically: Shedding light on Smoker's Angiographic Profile

7-Biochemical markers affecting left ventricular ejection

fraction in patients younger than 35 years of age with established coronary artery disease.

8-Associations of Vitamin D deficiency with Acute Myocardial infarction in Kurdish Patients.

9-The impact of Ramadan fasting on Acute Coronary Disease events among Iraqi Population.

10-Association of Hyperhomocysteinemia with Acute Myocardial Infarction in Kurdish Patients.

11-Association of Arterial Hypertension with Acute Myocardial Infarction among Iraqi Patients.

12-association of obstructive sleep apnea with cardiovascular health.

13- Prevalence persistent symptoms after acute COVID-19 among Iraqi Patients

# لیستی کتێبەکانی دەزگای فام

١- پێگەیشتن، بیرەوەرییەکانی میشێل ئۆباما، میشێل ئۆباما/ وەرگێڕانی: هێما ئەحمەد.

٢- تیۆری فستق١، گەشەپێدانی مرۆیی، فهد عامر الاحمدي/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٣- زانکۆ بەخێرهاتنت دەکات، ڕێبەر بۆ فێرخوازانی زانکۆ، جاسم بن هارون الهارون/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی

٤- زازانا، ڕۆمان، کامەران خۆشناو.

٥- ئەتەکێتی سەردەمییانە، چۆنییەتی هەڵسوکەوتی ڕۆژانە بۆ گەیشتن بە لووتکەی ئەتەکێت، دۆرسیا جۆنسن، لیڤ تایلەر/ وەرگێڕانی: کۆمەڵێك وەرگێڕ.

٦- پێغەمبەر و پێغەمبەرناسی، ئایینی، سەرحەد یونس محەمەد.

٧- هێزی ئێستا، ڕۆحانی، ئێکهارت تۆڵێ/ وەرگێڕانی: بنار جەبار

٨- جثثُ أحلام، شعر، نرکز ادریس شکر.

٩- ضجيج أبْكَمْ، شعر، إليسا حاجو.

١٠- زنجیرەی ڕەوشتە باشەکان، منداڵان (٨ کتێب)/ وەرگێڕانی: کەوسەر تەها

١١- زنجیرەی خێزانەکەم، منداڵان (٤ کتێب)/ وەرگێڕانی: کەوسەر تەها.

١٢- نیل بە سارای سیناوە، گەشتنامە، کەریم کاکە.

١٤- سەما لەگەڵ ژیان، ژیاندۆستی، مەهدی ئەلموسەوی/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

١٥- دەمەوێ بژیم، ژیاندۆستی، مەهدی ئەلموسەوی/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

١٦- چوار ڕێککەوتنەکە، پەرتووکی ژیرییەتی شارستانییەتی تۆڵتیکەکان، گەشەپێدانی مرۆیی، دۆن میگێل ڕیز/ وەرگێڕانی: کاژین ئەحمەد.

١٧- ڕێکخستن، هونەری ژاپۆنییەکان بۆ نەهێشتنی ئاڵۆزی و ڕێکخستنی ماڵ، هونەری ڕێکخستنی

١٨- ئەقڵییەت، گەشەپێدانی مرۆیی، کارۆڵ دوێك/ وەرگێڕانی: بنار جەبار.

١٩- ئاشتی لە هەموو هەنگاوێکدایە، گەشەپێدانی ڕۆحی، تیك نیۆت هان/ وەرگێڕانی: بنار جەبار.

٢٠- کوردستان لە سیاسەتی ڕۆژئاوادا، خوێندنەوەی ستراتیژی، سەروەر حەمە ئەحمەد.

٢١- مرۆڤی بێخود، فیکری، د. عەلی شەریعەتی/ وەرگێڕانی: بەڵێن ئەنوەر.

٢٢- بە بەتاڵی بمرە، گەشەپێدانی مرۆیی، تۆد هێنری/ کۆمەڵێك وەرگێڕ.

٢٣- حەکایەتی کوردی، ئەفسانەی کوردەواری، م. ب. ڕوودینکۆ/ وەرگێڕانی: ڕەنجدەر ئازاد عەزیز.

٢٤- سێ کچەکەی حەوا، ڕۆمان، ئەلیف شەفەق/ وەرگێڕانی: فەرهاد چۆمانی.

٢٥- دواهەمین کاتژمێری ئێمە، زانستی (فیزیا)، مارتن ڕیس/ وەرگێڕانی: بنار جەبار.

٢٦- مرۆڤ زەوی نەدۆزیوەتەوە، ڕۆمان، دڵزار حەسەن.

٢٧- ژووری ڕووداوەکان، یادەوەرییەکان لە کۆشکی سپییەوە، بیرەوەری، جۆن بۆڵتن/ کۆمەڵێك وەرگێڕ.

٢٨- تیۆری فستق١، (چاپی دووەم) گەشەپێدانی مرۆیی، فهد عامر الاحمدي/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٢٩- تیۆری فستق٢، گەشەپێدانی مرۆیی، فهد عامر الاحمدي/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٣٠- ڕازەکانی گێڕانەوە، خەیاڵی مێینەیی و زمانی ژمانە لەناو ڕۆماندا، ئەدەبی، نووری بێخاڵی.

٣١- بازنەکەی دایکم، گەشەپێدانی مرۆیی، علی بن جابر الفيفي/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٣٢- چۆن بەو شێوەیە بژین کە دەمانەوێت، گەشەپێدانی مرۆیی، دیمەن عەبدوڵڵا و چیمەن عەبدوڵڵا.



٣٣- ڕێگاکانی [illegible]

٣٤- ئەو ڕۆژانەی مەرگی خۆمم بینی، بیرەوەری، هەژار مەجید.

٣٥- سمینارم هەیە، فێرکردن، د. فەرهاد عەلی مستەفا.

٣٦- شەهرەزاد وەئاگا دێتەوە، چیرۆك، کۆمەڵێك نووسەر/ وەرگێڕانی: سەنگەر زراری.

٣٧- کورتە چیرۆك و مەرجە هونەرییەکانی‌لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، کۆمەڵێك نووسەر/ وەرگێڕانی: سەنگەر زراری.

٣٨- چیرۆکی سەرکەوتن (١٠٠ کەسایەتی)، ژیاننامەی ناوداران، محەمەد عەبدوڵلا کەلاری.

٣٩- گوڵەستێرەکان کوژانەوە، بیرەوەری، کەریم کاکە.

٤٠- ٨ کەس پێویستە لە ژیانی خۆت بیانخەیتە دەرەوە، تەهانی ئەلهاجەری/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٤١- ١٠١ ڕێگا بۆ بوون بە فرۆشیارێکی سەرکەوتوو، ڕابەر کەریم بەکر.

٤٢- بە مردنی تۆ جیهان چ زیانێکی پێ دەگات؟ (هونەری دروستکردنی ژیان و جێهێشتنی جێپەنجەت تیایدا)، خزر بن سالم بن حلیس ئەلیافعی/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٤٣- چەواشە، ڕۆمان، عەزیزی مەلای ڕەش.

٤٤- داکشان، فێرت دەکات چ کاتێك پاشەکشە بکەی و چ کاتێکیش سوور بی لەسەر هەڵوێستەکانت؟!، سیس گۆدین/ لە ئینگلیزییەوە: کاروان حەسەن عەزیز.

٤٥- فیزیای بەختەوەری، یاساکانی ژیانت ڕێك بخە بۆ ئەوەی دوور بی لە شکست. گەشەپێدانی مرۆیی. سەعید ئەلنەوبان/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٤٦- لەودیو دەرگا داخراوەکانەوە، نهێنییەکانی بوون بە بەڕێوەبەرێکی مەزن. جۆهانا ڕۆزمان و ئیسەر دێربی/ لە ئینگلیزییەوە: عەبدوڵڵا ئیبراهیم عەزیز.

٤٧- مەلا تایەری یاروەیسی جاف، دیرۆکی هەشتا و پێنج ساڵ تەمەن. بیرەوەری. سەرحەد یونس محەمەد.

٤٨- ئەو پرسیارە سەیرانەی لە کتێبفرۆشان دەکرێن. باس و بەسەرهات. جێن کامپڵ/ لە ئینگلیزییەوە: سەنگەر حەسەن نەجم.

٤٩- ئەو دەمەی کیمیا دەدوێ. زانستی. مونجید سەقر/ کاروان حەسەن عەزیز.

٥٠- سیستەمی ئینگلیزیی ئاسان. ئینگلیزی بە جۆرێك فێربە، کە وەك خەڵکی ئینگلیز قسە بکەی. ئەی جی هۆگ/ لە ئینگلیزییەوە: ئازاد مەحموود.

## مێژووی زانستی
## نەخۆشییەکانی دڵ

د. شوان عوسمان ئەمین



### د. شوان عوسمان ئەمین

- دەرچووی کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر لە ساڵی 1999- 2000.
- دکتۆرا لە نەخۆشییەکانی دڵ و هەناو (ئەڵمانیا).
- دکتۆرا لە نەخۆشییەکانی دڵ (قسطرة) و دانانی ئامێری ترپەڕێکخەری دڵ (ئەڵمانیا).
- دکتۆرا لە جۆرەکانی تۆڕ (شبكة) و فراوانکردنی خوێنبەرەکانی دڵ (ئەڵمانیا).
- ڕاهێنراو لە سەنتەری تایبەت بە چارەسەرکردنی نەخۆشیی پەککەوتنی دڵ (ئیسپانیا) و نەخۆشیی بەرزیی فشاری خوێن لە سییەکان لە ئیتاڵیا، لەسەر دەستی پرۆفیسۆر گالی.
- ڕاهێنراو لە نەخۆشخانەی ڕۆیال برۆمپتۆن لە لەندن، لەلایان پرۆفیسۆر کریستۆف نین ئابر، بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی دانانی تۆڕ بۆ شادەمار . EVAR
- بەشداربوویيەکی چالاك بووە لە کۆنگرەکانی نەخۆشییەکانی دڵ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا-واشنتۆن، شیکاگۆ، لۆس ئەنجلس و هیوستن.
- بەشداربوویيەکی چالاك بووە لە کۆنگرەکانی نەخۆشییەکانی دڵ لە تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن.

ئەمە یەکەم کتێبە بە زمانی شیرینی کوردی، کە وەك دەروازەیەك دەربارەی مێژووی سەرهەڵدانی پسپۆرییەکی ورد نووسرابێت، ئەویش؛ زانستی نەخۆشییەکانی دڵ و بەرەوپێشچوونەکانە لەم بوارەدا.

لەم کتێبەدا زانستخوازان و خوێنەرانی کورد ئاشنا دەکەین بە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی پسپۆرییەکە و هەوڵەکان بۆ بەرەوپێشخستنی.

تیشك دەخەینە سەر هەماهەنگی و بەیەکەوە کارکردنی زانایان و پزیشکان لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بۆ زیاتر تێگەیشتن لە دیوە نەزانراوەکانی نەخۆشییەکانی دڵ.

ئامانجمان، ناساندنی خوێنەرانی کوردە بە دیوە نەبینراوکان و بەرزنرخاندنی هەوڵە بەردەوامەکانی پزیشکانە، کە هەمیشە کاریان کردووە بۆ ئاسانکاری لە دۆزینەوە و دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی دڵ.

ئومێد دەخوازین خۆشمان بتوانین هەمیشە نوێگەر و داهێنانکار بین لە زانستی پزیشکی بە گشتی و نەخۆشییەکانی دڵ بە تایبەتی.

بە هیوای چێژوەرگرتن لە خوێندنەوەی..


FAM PUBLICATION

+964 750 773 71 76

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication